زنجیرەی ئیسلام و زانست

١

# قورئان و ئاژەڵناسی

قورئان و زانست

5

ئامادەکردنی

سەروەر ڕەحمان

پێداچوونەوەی زانستی

دکتۆر زانا محەمەد





زنجیرەی قورئان و زانست (٥)

# قورئان و ئاژەڵناسی

ئامادەکردنی

## سەروەر حەسەن

پێداچوونەوەی زانستی و پێشەکی

**د.زانا حمید محمود**

بەکالۆریۆس لەپزیشکی و نەشتەرگەری ڤێتێرنەری

دبلۆمی باڵا لە وردەزیندەزانی گەردیی

پێداچوونەوەی زمانەوانی

**م. محمد شریف صالح**

بەکالۆریۆسی زمانی کوردی



ناوی کتێب بەکوردی: قورئان و ئاژەڵناسی
ئامادەکردنی: سەروەر حەسەن
پێداچونەوەی زانستی: د. زانا حمید محمود
پێداچونەوەی زمانەوانی: م. محمد شریف صالح
بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن هەولێر
نەخشەسازی ناوەوە: جمعە صدیق کاکە
خەت: نەوزاد کۆیی
بەرگ: أمین مخلص
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣٢ك – ٢٠١١ز
تیراژ: ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ١٣٢٠ ) ساڵی ٢٠١١ پێدراوە

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دەدگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل: ٠٧٥٠٤٦٠٥١٢٢ - ٠٧٧٠١٣٨٧٢٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

## ناوەرۆك

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# پێشەکی

**بەقەڵەمی د. زانا حمید محمود**

بەدیهێنان و هێنانەکایەی ژیان لە نەبوونەوە بۆ بوون و لە نادیارەوە بۆ دەرکەوتن، لەسەر زەوی یان لە هەر شوێنێکی ئەم گەردوونەدا بێت، لەخۆیدا ئیعجازێکی بێ هاوتای خوای گەورەیە، جا لە سادەترین زیندەوەری تاك خانەییدا بێت یان لە زیندەوەرە باڵا و خانە راستەقینەییەکاندا بێت.

لەکاتێکدا لێکۆڵینەوە و نیشاندانی لایەنە سەرسوڕهێنەرەکانی ناو جیهانی ئاژەڵ و باڵندەکان پانتاییەکی گەورە لە زانستی راستەقینەدا داگیردەکات، لەهەمان کاتدا گەورەیی و دەسەڵاتی خوای تاك و تەنیا لەخودی ئەو گیانەوەرانەدا نیشان دەدات... هەبوونی چەندین پێکهاتە و ئەندام و فرمانی سەرسوڕهێنەری ئەو گیانەوەرانە (بەخودی مرۆڤیشەوە) بەتەواوی بیری مرۆڤی سەرقاڵ کردووە، تەنانەت ئاتێیستاش زانست لەبەرامبەر بەشێکی زۆری ئەندام و فرمانەکانی لەشی گیانەوەراندا دەستەوسان وەستاوە و بە سەدان و هەزاران توێژینەوەی زیاتریان پێویستە بۆئەوەی نهێنییەکانیان ئاشکرا بکرێت، کە بێگومان جار لەدوای جاریش گەورەیی خوای بەدەسەڵات دووپات دەکەنەوە.

بەوپێیەی سەرچاوەکانی ئایینی ئیسلام لە قورئان وسوننەت ژمارەیەکی زۆریان لەو ئاماژە ئیعجازیانە لەخۆگرتووە، لەو سۆنگەیەوە نووسین و وەرگێڕان و ڕوونکردنەوەی بابەت و کتێب و ئەو وانانەی لەبارەی ئیعجازە زانستییەکانی قورئان و سوننەت بە زمانی شیرینی کوردی دەخرێنە بەردەستی خوێنەری کورد، سوودێکی گەورە دەگەیەنن و ئاستی زانستی خوێنەران بەرزدەکەنەوە.

ئامادەکردنی کتێبی (قورئان و ڕووەکناسی)ش لەلایەن بەڕێز "م.سەروەر حەسەن"ەوە پانتاییەکی گەورەی بابەتەکانی ئیعجازی زانستی لە قورئاندا، بەشێوەیەکی جوان و ڕوون و بەپشت بەستن بە سەرچاوە زانستییەکان، لەخۆگرتووە. ئومێد دەکەم خوای گەورە پاداشتی ماندوبوونی ئامادەکار بداتەوە و خوێنەری کوردیشی لێ بەهرەمەند بکات.

بەهیوای سەرکەوتنی ئامادەکار و ئامادەکردنی بەرهەمی زیاتر لەم بابەتانەدا.

د.زانا حمید محمود

بەکالۆریۆس لە پزیشکیی و نەشتەرگەری ڤێتێرنەری

دبلۆمی بالا لە وردەزیندەزانی گەردیی

سلێمانی ١٢/ ١ /٢٠١١

# پۆلی ئاژەڵان ( پۆلێنی ئاژەڵان )

قورئـانی پـیرۆز پـۆلێنکردن و دابەشـکردنی ئـاژەڵانی بـۆ چـەند بەشـێك ئاماژەپێـداوە. خـوای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٍ مِّن مَّآءٍ فَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰ بَطْنِهِۦ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰ رِجْلَيْنِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰٓ أَرْبَعٍ يَخْلُقُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ النـور/٤٥، واتـە: خـوا هـەموو زینـدەوەرێکی لـە ئاوێکی تایبەت دروستکردووە، جا هەیانە لەسـەر سـکی دەڕوات، هەشـیانە لەسەر دوو قاچ دەڕوات، هـەروەها هەیانـە لەسـەر چـوار پـێ دەڕوات، خـوا هەرچـی بوێـت دروسـتیدەکات، بەڕاسـتی خـوا دەسـەڵاتی بەسـەر هـەموو شتێکدا هەیە.

یـــان دەفـــەرموێت: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم مَّا فَرَّطْنَا فِي ٱلْكِتَٰبِ مِن شَيْءٍ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ﴾ الانعـام/٣٨، واتـە: هیچ زیندەوەر و گیانلەبەرێك نییە بەسەر زەویدا بڕوات و هیچ باڵندەیەك بە باڵەکانی بفڕێت و ئەوانیش ئوممەت و گەلێك نەبن وەك ئێوە (دڵنیابن) هـیچ شـتێك نییـە پشـت گوێمـان خسـتبێت لـە کتێبـە (تایبەتییەکـەی لـوح المحفـــوظ)دا، لـــەوەودوا هەرهـــەموو ئەوانـــە بـــۆلای پـــەروەردگاریان کۆدەکرێنەوە.

زانای بایۆلۆجی ئەمریکی "Artur L. Koch" لە زانکۆی (ئیندیانا) لـە کتێبی ( The bacteria; Their origin, structure. Function and antibiosis"دوای وردبوونەوە لە سیستەمی ئـاڵۆز و پـڕ وردەکـاری

ئەنزیم و پرۆتینە تایبەتییەکان و ژمارەی بێشوماریان لە تاکە خانەیەکدا، تەنها یەك بیرۆکە بە بیری مرۆڤێکی ژیردا دێت (دەربارەی دروستبوونی ژیان) کە هەرگیز ناکرێت ئەو هەموو ڕێکوپێکی و سیستمە نایابە هەر لەخۆوە و بەڕێکەوت بەدیهاتبێت، ئیتر لەهەر ژینگەیەکدا بێت و هەر شرۆڤەو لێکدانەوەیەکی فیزیایی و کیمیایی بۆ بکرێت و چەندیش کاتی خایاندبێت.

لەڕاستیدا دوو بیرکردنەوەی جیاواز دەربارەی سەرهەڵدانی ژیانی مرۆڤ و زیندەوەران (بە تاك خانەکانیشەوە) هەیە: یەکەمیان ئەوەیە کە خوای گەورە ژیانی مرۆڤ و زیندەوەرانی بەو هەموو ئاڵۆزی و وردەکارییەوە لەسەر زەوی ئافراندووە، کە هەریەکەیان خەسڵەت و تایبەتمەندی و زیندەچالاکی تایبەت بەخۆیان هەیە و بەهیچ شێوەیەك جۆرێکی سەربەخۆ لەجۆرێکی تری جیاواز لەخۆیەوە دروستنەبووە.

بۆچوونی دووەم پێیوایە ژمارەیەك کارلێکی کیمیایی هەرەمەکی دوابەیەك ڕوویانداوە و دووپاتبوونەتەوە، تا لەکۆتاییدا خانەیەکی زیندووی لێ بەرهەمهاتووە.

لێرەدا وردبوونەوەیەك پێویستە، ئەگەر زۆربوون و گەشەی تاکەخانە چالاکبوونی هاوکاتی هەزاران ئەنزیمی پێویست بێت، ئەوا بەدڵنیاییەوە ڕوودانی ڕێکەوتێکی لەوجۆرە (کە بۆچوونی دووەم بانگەشەی بۆ دەکات)، ئەستەمێکی زۆر دوورە.

بوون و گەربوون ملکەچی ڕێساگەلێکن کە زاتێکی مەزن و بەدەسەڵات ئافراندوونی، ئەویش (الله)یە، ئەو خوایە لەتوانایدایە ژمارەی زۆر و زەوەندەی زیندەوەران، بەو هەموو شێوە و قەبارە و تایبەتمەندییە جیاوازانەوە، بەدیبهێنێت.

ئاکە سیستمێك لە بەناو باسای ڕێکەوتدا بوونی هەبێت، ژمارەیەکی نێگجار زۆری دووپاتبوونەوەیە کە بۆ دروستبوونی یەکەم خانەی زیندوو پێویستە، دواتریش هەر بەڕێکەوت گەشە بکات و گەورە ببێت و بارزانی تێدا ڕووبدات و شێوەی جیاوازی لێوە پێکبێت، ئەمە لەکاتێکدایە کە بۆ هەریەك لە خەسڵەتەکانی خانە ملیۆنان کارلێکی کیمیایی و کاریگەریی نیشانە و ڕیزبوونی کۆدەکان و دابەشبوونی خانەکان (لە فرەخانەکاندا) پێویستن... بۆیە دەبێت ئەو هەموو گۆڕانکارییە ورد و پڕ یاسایانە لە ڕێکەوتدا کۆببنەوە و ئەوەش لە ئەستەم ئەستەمترە و ئەقڵی ژیر و هۆشیار ڕێکەوتی کەڕ و کوێر ڕەتدەکاتەوە و دڵنیایانە بوونی بەدیهێنەری توانا (الله) پەسەند دەکات."

شانشینی ئاژەڵان چەندین جۆری تێدایە، هەیانە لەسەر سکی دەڕوات وەك خشۆکەکان و هەیشە لەسەر دوو پێ دەڕوات وەك مرۆڤ. لەوجۆرەش کە لەسەر چوار پێ دەڕوات وەك زۆربەی ئاژەڵان... خەڵك دیمەنی جوڵەی ئاژەڵانیان بینیوە و هیچ سەرسامییان بەرامبەری نەبووە، بەڵام زانایانی سەرقاڵ بە بواری زیندەوەرزانی، لەدوای پشکنین و سەرنجدان و شیکارییەوە، دەرئاساکانی بەدیهێنان و وردبینی دروستکردن دەبینن، کە هەر جۆرە هاوکاریی گونجانیان لەگەڵ بزێوی و ژیانیاندا دەستەبەر دەکەن. خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَفِي خَلْقِكُمْ وَمَا يَبُثُّ مِن دَابَّةٍ آيَاتٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾الجاثیة/٤، واتە: لە دروستکردنی ئێوەدا، هەروەها لەو هەموو زیندەوەرە جۆراوجۆرانەی کە لەسەر زەوی و ژێر زەوی و ناو ئاودا هەن و بڵاویان دەکاتەوە بەڵگە و نیشانە هەن لەسەر دەسەڵاتی خوا بۆ کەسانێك کە دڵنیان و باوەڕی دامەزراویان هەیە.

زانایـــانی زینـــدەوەرزانی لـــەڕێی لێکۆڵینـــەوەی ژیـــانی کۆمەڵایـــەتی ئاژەڵانەوە، سا لەوانەی لەسـەر زەوی دەجـوڵێن، یـان بەئاسمانـدا دەفـڕن، یاخود لە ئاودا مەلەدەکەن، بۆیان دەرکەوتووە کە ئـەوانیش گـەل و هـۆز و نەتەوەگـەلێکن و پەیوەنـدی تونـدوتۆڵ و پتـەو پێکیانـەوە دەبەسـتێت، شێوازی ژیان و چالاکییان جیاوازی نییە لەگەڵ ئەوەی مرۆڤ کە سـەر زەوی ئاوەدان دەکەنەوە.

زانایانی زیندەوەرزانی و توێکاریی دانراوی زۆریان هەیە و ئەو زانیاری و ڕاستییانە لـەخۆدەگرن کـە لـەبارەی سیسـتمی هـەر جۆرێـك لـە شـانشـینی ئاژەڵاندا پێیگەیشـتوون، بـەجۆرێکی ئـەوتۆ کـە هـیچ گومـان و دوودڵییـەك ناهێڵنەوە لەسـەر ئەوەی ئـاژەڵانیش نەتەوەگـەلێکی وەك مـرۆڤن، لـەدۆخی شەڕ و ئاشتیدان، هەوڵ بۆ بەدەستخستنی خۆراك دەدەن، چاودێری بێچوو و لاوازەکان دەکەن، هەروەها پـەنا بـۆ فێـڵ و تەڵەکـە دەبـەن بـۆ زاڵبـوون بەسەر نارەحەتی و مەترسییەکاندا. وێڕای هەڵبژاردنی سروشـتێك بۆخۆیـان کە لەگەڵ پێکهاتە و ژینگەکەیاندا گونجاو بێت.

# سوودەکانی مەڕومالاّت

دەربارەی بەدیهێنانی ئاژەڵان و زیندەوەران، هەروەها ئەو ئامانجانەی لەپێناویاندا بەدیهێنراون، خوای گەورە لە پەرتوکە پیرۆزەکەیدا دەفەرموێت: ﴿وَٱلْأَنْعَٰمَ خَلَقَهَا ۗ لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَٰفِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ۝٥ وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ ۝٦ وَتَحْمِلُ أَثْقَالَكُمْ إِلَىٰ بَلَدٍ لَّمْ تَكُونُوا۟ بَٰلِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ ٱلْأَنفُسِ ۚ إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾النحل/٥-٧، واتە: مالاّتی دروستکردووە بۆ خزمەتی ئێوە، (لە خوری و موو و پێستیان جۆرەها پۆشاك و رایەخ دروستدەکەن) کە گەرمیتان پێدەبەخشێت (لە سەرما و سۆڵەدا)، هەروەها جۆرەها سوودی تری لێوەردەگرن لە شیر و گۆشتەکەیشی دەخۆن. کە لە ئێوارەدا مالاّتەکان دەهێننەوە (بە تێری و شیرەوە)، لە بەرەبەیانەکانیشدا کە لە ماڵ دەریاندەکەن، دیمەنێکی جوانتان بۆ دەنوێنن. هەندێك لەو مالاّتانە بار و کەلوپەلی سەنگینتان هەڵدەگرن بۆ ولاّت و شوێنێك کە ئێوە دوای زەحمەت و ماندووبوونێکی زۆر نەبێت پێی نەدەگەیشتن. بەڕاستی پەروەردگارتان زاتێکی زۆر بەسۆز و میهرەبانە.

یان دەفەرموێت: ﴿وَمِنَ ٱلْأَنْعَٰمِ حَمُولَةً وَفَرْشًا ۚ كُلُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾الأنعام/١٤٢، واتە: (هەر خوا) هەندێك لە مالاّتی بۆ ئێوە رامهێناوە کە بۆ باربردن بەکاریان دەهێنن (لە خوری و مووی هەندێکی تریان) فەرش و رایەخ دروستدەکەن و بۆ

سواریش هەندێکی تریان بەکاردەهێنن، دە بخۆن لەو ڕزق و ڕۆزییەی کە خـوا پێـی بەخشیوون، نەکـەن شـوێن هـەنگاو و (نەخشـە و پلانـەکانی) شەیتان بکەون، چونکە بەڕاستی ئەو دوژمنێکی ئاشکرای ئێوەیە.

هـەروەها پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّن بُيُوتِكُمْ سَكَنًا وَجَعَلَ لَكُم مِّن جُلُودِ الْأَنْعَامِ بُيُوتًا تَسْتَخِفُّونَهَا يَوْمَ ظَعْنِكُمْ وَيَوْمَ إِقَامَتِكُمْ وَمِنْ أَصْوَافِهَا وَأَوْبَارِهَا وَأَشْعَارِهَا أَثَاثًا وَمَتَاعًا إِلَىٰ حِينٍ﴾ النحل/٨٠، واتە: هەر خوایە (کە هەموو شتێکی بۆ ڕەخساندوون تـا مـاڵ و خانووبـەرە دروست بکـەن) ماڵەکانتانی بۆ کردوون بەهۆی ئارامگرتن و حەوانەوە و لـە پێست و مووی مـاڵاتیش دەتـوانن شـوێن و جێگـا بۆخۆتـان بسـازێنن، پاشـان لـەکاتی کۆچتاندا بەئاسـانی بیگوێزنـەوە، لـەکاتی نیشتەجێ بوونتانـدا بەئاسـانی هەڵی بدەن و لە خوری و کوڵك و مووەکەی، دەتوانن کەلوپـەل و شتومەك بۆخۆتان دروستبکەن و تا ماوەیەك سوودیان لێوەربگرن.

﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً ۖ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِ مِن بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَائِغًا لِّلشَّارِبِينَ ﴾النحل/٦٦، واتە: بەڕاستی لە بوونی ماڵات و (زیندەوەرانی جۆراوجۆردا) پەند و ئامۆژگاری هەیە بۆتـان و جێگـای سـەرنج و تێڕامانە، لەنێوان ئەو شتانەی کە لە سکیاندا هەیە، لە گژوگیای هەرسکراو و خوێنـدا شیرێکی پـاك و بێگـەرد و خـۆش و بـەتام بەرهـەم دەهێنێـت بـۆ ئەوانەی دەیخۆنەوە.

﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً ۖ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهَا وَلَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ۝ وَعَلَيْهَا وَعَلَى الْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴾المؤمنـون/٢٠-٢١، واتـە: بەڕاستی بـەدیهاتنی مـاڵاتیش جێگـای سـەرنج و پەنـدە بۆتـان (کـە وردبینـەوە و

بەدیهێنەری جوانکار بناسن) جا لەوەی کە لە سکیاندا بەدیدێت (مەبەست شیرە) دەرخواردتان دەدەین و زۆر کەڵکی تری بۆتان هەیە (لە پێستیان، لە خوری و موویان...هتد) هەروەها لێشیان دەخۆن. لەسەر پشتی هەندێك لەو گیاندارانەش هەڵدەگیرێن و لەسەر کەشتییەکانیش.

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَنْعَٰمَ لِتَرْكَبُوا۟ مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ وَلِتَبْلُغُوا۟ عَلَيْهَا حَاجَةً فِى صُدُورِكُمْ وَعَلَيْهَا وَعَلَى ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴾غافر/٧٩-٨١، واتە: هەر خوایە کە ماڵاتی بۆ ئێوە رامهێناوە تا هەندێکی بۆ سواری بەکاربهێنن و هەندێکیشی بۆ خۆراك سوودی لێ وەربگرن. هەروەها سوودی زۆری ترتان دەست دەکەوێت لەو ماڵاتانەدا، بۆئەوەی بەسواری ئەوانە بگەنە ئەو شوێنانەی نیازتان لەدڵدایە بیگەنێ و کاروباری خۆتان ئەنجام بدەن، جا بەسواری ئەو وڵاخانە و کەشتیش هەڵدەگیرێن.

ئەو ئایەتە پیرۆزانە ئاماژە بەوە دەدەن کە ماڵات لە چەندین رووەوە سوودیان بۆ مرۆڤ هەیە، لەوانە:

بەرهەمهێنانی شیر: ﴿نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِى بُطُونِهَا﴾.

بەرهەمهێنانی گۆشت: ﴿وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ﴾.

بەکارهێنانی لە کاردا: ﴿وَتَحْمِلُ أَثْقَالَكُمْ﴾.

هەروەها کۆمەڵە سوودێکی تر: لە دروستکردنی کولك و پۆشاك و پێست و موودا... هتد. ﴿وَجَعَلَ لَكُم مِّن جُلُودِ ٱلْأَنْعَٰمِ بُيُوتًا﴾، ﴿وَمِنْ أَصْوَافِهَا وَأَوْبَارِهَا وَأَشْعَارِهَآ أَثَٰثًا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٍ﴾.

ئەو ڕوانەی باسکران لە سوودگەلی ئاژەڵان، زانستی بەرووبوومی ئاژەڵی کردوویەتیە ئامانجێکی سەرەکی، زانایانی پسپۆڕی ئەم بوارە ئەوپەڕی کۆشش بۆدەستەبەرکردن و زیادکردنی ئەو بەرهەم و سوودانە دەکەن.

دواجار زانست وێکچووی قورئانە لەو بەکارهێنانەدا کە لەئایەتە پیرۆزەکاندا ڕوون کراونەتەوە.

# جۆرەکانی ماڵات

خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿ثَمَٰنِيَةَ أَزۡوَٰجٖۖ مِّنَ ٱلضَّأۡنِ ٱثۡنَيۡنِ وَمِنَ ٱلۡمَعۡزِ ٱثۡنَيۡنِۗ قُلۡ ءَآلذَّكَرَيۡنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ أَمَّا ٱشۡتَمَلَتۡ عَلَيۡهِ أَرۡحَامُ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۖ نَبِّـُٔونِي بِعِلۡمٍ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ (١٤٣) وَمِنَ ٱلۡإِبِلِ ٱثۡنَيۡنِ وَمِنَ ٱلۡبَقَرِ ٱثۡنَيۡنِۗ قُلۡ ءَآلذَّكَرَيۡنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ أَمَّا ٱشۡتَمَلَتۡ عَلَيۡهِ أَرۡحَامُ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۖ أَمۡ كُنتُمۡ شُهَدَآءَ إِذۡ وَصَّىٰكُمُ ٱللَّهُ بِهَٰذَاۚ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا لِّيُضِلَّ ٱلنَّاسَ بِغَيۡرِ عِلۡمٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾الأنعـام/١٤٣-١٤٤، واتــە: (خوای گەورە) هەشت جووت ماڵاتی (بۆ خزمەتی مرۆڤ دروستکردووە) لە مەڕ جووتێك و لە بزنیش جووتێك (ئەی موحەممەد (ﷺ) بەو نەفامانە بڵێ کە هەر لەخۆیانەوە شت حەرام دەکەن) ئایا خواردنی گۆشتی نێرەکانی حەرام کردووە یان مێیەکانیان ئەوەی کە لەسکی مێیەکاندا هەیە؟ ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن و بەڵگەیەکی زانستیتان هەیە، بۆمان ڕوون بکەنەوە؟! هەروەها لە وشتر جووتێك و لە ڕەشەوڵاخیش جووتێك، (دووبارە پێیان بڵێ: ئایا خواردنی گۆشتی نێرەکانی حەرام کردووە یان مێیەکان، یان ئەوەی کە لە سکی مێیەکاندا هەیە؟! یاخود ئێوە (وا دیارە) شایەت بوون و لەوێ بوون کاتێك خوا بڕیاری بەوجۆرەی بۆدان؟! جا ئیتر کێ لەوە ستەمکارترە کە درۆی بەدەم خواوە هەڵبەستووە تا بەبێ زانست خەڵکی سەرلێشێوا بکات، بەڕاستی خوا هیدایەتی دەستەی ستەمکاران نادات.

لەم دوو ئایەتە پیرۆزەدا خوای مەزن ئاژەڵانی بە هەشت جووت دیاریکردووە، واتە: چوار کۆمەڵە، کە هەر کۆمەڵەیەکیان لە نێر و مێ

پێکـدێن، چـوار کۆمەڵەکـەش بـریتین لـە: مـەڕ، بـزن، وشـتر و مانگـا (ڕەشەوڵاخ).

هەروەها ئەو دوو ئایەتە باس لە بێباوەڕان دەکات کە هەندێك جۆر یان تاکی ئاژەڵان حەرام دەکەن بەبێ بەڵگەیەکی دروست و پەسـەند، ئەمـەش بەڵگەی نەزانی و نەفامییانە.

یەکێك لـە پۆلێنـەکانی ئـەو مـەڕ و ماڵاتانـە لـە زانستی زیندەوەرزانیـدا بەمجۆرەیە:

١. پۆلی وشتر: کە وشتری یەك کۆپار و دوو کۆپار دەگرێتەوە.

٢. پۆلی مانگا (ڕەشەوڵاخ): کە کۆمەڵێك ئاژەڵی زۆر دەگرێتـەوە کـە لـە هەموو جیهاندا بلاون.

پۆلی ڕەشەوڵاخ: مانگا و گامێش و ئەم جۆرانە دەگرێتەوە.

٣. مەڕ و ماڵاتـەکان لەپێشـەوەی ئـاژەڵانی تـردان لـەڕووی زەوەنـدەیی سوودەکانیانەوە. قورئان ئەمەی تۆمارکردووە و زانستیش سەلماندوویەتی.

ئەمە مەڕ و ماڵات کە لەقورئانی پیرۆزدا باسکراون، زانستی نوێ هاتووە تاکو ناوەڕۆك و بەشەکانی بەدیار بخـات... کەسێك تەئـەمولی تێدا بکـات ناتوانێـت نـەڵێت: پاکوبێگـەردی بـۆ ئەوخوایـەی ئـەم هۆکـارەی بـۆ بەگەڕخستین گەرچی توانامان نـەبوو بۆی (سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقۡرِنِينَ).

# بەدیهێنانی سەگ

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿ وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ ۚ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث ۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا ۚ فَٱقْصُصِ ٱلْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴾الأعـراف/١٧٦، واتـه: خـۆ ئەگـەر بمانویستایە ئەوە بەو ئایەت و فەرمانانە بەرزمان دەکردەوە، بەڵام ئەو خۆی چەسپان بە زەوییەوە و (دەستی کرد بە دونیاپەرستی و) شوێن ئارەزووی خۆی کەوت، جا نموونەی (ئەو جۆرە کەسانە) وەکو نموونەی سەگ وایە ئەگەر دەری بکەیت و پیایدا هەڵبشاخێیت هەناسەبڕکێیەتی (زمـان دەردەکێشـێت)، یـاخود ئەگـەر وازی لێبهێنیـت ئـەوا هـەر هەناسەبڕکێیەتی، ئەوە نموونەی ئەو کەسانەیە کە ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ زانیـوە و بڕوایـان پێـی نـەبووە، کـەوابوو ئـەم جـۆرە بەسـەرهاتانە بگێڕەرەوە بۆئەوەی (دابچڵەکێن و) بیربکەنەوە.

لـەم ئایەتـە پـیرۆزەدا زانیارییـەك دەربـارەی سـەگ هـاتووە کـە دوای چوارده سـەده لـە دابـەزینی ئایەتەکـە ئینجـا دەرەنجامـە زانسـتییەکان دەریانخست و ئاشکرایان کرد.

زانستی نوێ لەم دواتوێژینەوانەدا ئاشکرایکرد کە سەگ ئارەقەڕژێنی نییە جگە لە کەمێك نەبێت لەبنی پێیدا، ئەمەش بەس نییە بۆ دابەزاندنی پلەی گەرمی لەشی. دیارە کە کاری ئارەقە ڕژێنەکان (بە دەردانی ئـارەق) پلـەی

گەرمی ڕووی دەرەوەی زیندەوەرەکە لەگەڵ ژینگەی دەوروبەری دەسازێنێت.

لەبەرئەوەیە سەگ، بەهۆی ئەوەی وەك ئاژەڵانی تر ئارەقەڕژێنی تەواوی نییە، لەڕێی دەرکێشانی زمانییەوە بە هەناسەبڕکێ پلەی گەرمی لەشی دادەبەزێنێت، بەهۆی هەناسەبڕکێیەکەیەوە زۆرترین ڕووبەری بۆشایی دەم و زمانی بەرکەوتەی هەوا دەبن. شایانی باسە سەگ ئەو کارە دەکات، لەپشوودا بێ یان لەکاتی ماندووبوونیدا.

# ڕەنگی مانگاکە

لە سورەتی (البقرة)دا چیرۆکی ئەو مانگایە دەخوێنینەوە کە خوای مەزن فەرمانی بە نەتەوەی موسا (سەلامی خوای لێبێت) دەدا سەری ببڕن... لە چیرۆکەکەدا و لەمیانەی گفتوگۆی نێوان موسا و نەتەوەکەیدا باس لە ڕەنگەکەشی دەکرێت.

خوای مەزن لەسەر زمانی موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) دەفەرموێت: ﴿قَالُوا ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَاءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ النَّاظِرِينَ﴾البقرة/٦٩، واتە: وتیان: داوا لە پەروەردگارت بکە بزانین ڕەنگی چۆنە؟ موسا وتی: بێگومان خوا دەفەرموێت: ئەو مانگایە مانگایەکی ڕەنگ زەردی (توخە!!)، تەماشاکارانی دڵخۆش دەکات.

هەر لەسەر زمانی (موسا) وە بە نەتەوەکەی دەفەرموێت: ﴿قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا ذَلُولٌ تُثِيرُ الْأَرْضَ وَلَا تَسْقِي الْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لَّا شِيَةَ فِيهَا قَالُوا الْآنَ جِئْتَ بِالْحَقِّ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُوا يَفْعَلُونَ﴾البقرة/٧١، واتە: موسا وتی: بەڕاستی خوا دەفەرموێت: ئەوە مانگایەکە هێشتا ڕانەهێنراوە زەوی بکێڵێت و جووت بکات، ئاودێری کشتوکاڵیش ناکات، هیچ ئەنگی نییە و یەک ڕەنگە و هیچ پەڵەیەکی تێدا نییە. ئەوسا وتیان: ئا ئێستا ئیتر هەواڵی

ڕاستەقینەت پێداین، (ئیتر دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر بەدەستیان هێنا و سەریان بڕی، هەرچەندە خەریك بوو ئەو کارەش نەکەن.

یەکێك لە ڕایە پەسەندەکان لە پزیشکی ڤێتێرنەریدا ئەوەیە: "باشترین و چاکترین مانگا ئەوەیە کە ڕەنگەکەی زۆر زەرد و بێگەرد بێت، ڕەنگەکەی بێگەرد بێت و سەلامەتی دڵنەکانیش تەندروستی مانگاکەن".

هەروەها لە نیشانەکانی جۆرچاکی و باشییەکەی تۆز هەستاندنیەتی لە جێ پێیەکانیەوە لەکاتی ڕێکردنیدا، ئەوەش بە کاریگەریی هێز و توندییەوە. کار و ماندوویەتیشی نەبینیبێت لە کێڵانی زەوی و کارە کشتوکاڵییەکاندا.

زانستی نوێ ئاشکرایکرد: "ڕەنگی زەرد لە ئایەتەکەدا دەلالەتی تایبەتی هەیە، ڕوون بووەتەوە کە بۆ بینینی ڕەنگی زەرد پێویست بە هێزی هاوێنە ناکات، واتە: بەبێ ماندووبوونی چاو، هەر خۆی ڕاستەوخۆ لەسەر تۆڕەی چاو کۆدەبێتەوە. لەکاتێکدا کە مەسەلەکە جیاواز دەبێت (بۆنموونە بۆ ڕەنگی سوور) هاوێنەی چاو پێویستی بە هێز و توانایی هەیە بۆ بینینی ڕەنگی سوور.

ئەمە وەهامان لێدەکات لەو ئایەتەی قورئانی پیرۆز تێبگەین کە ئاماژە بە ڕەنگی زەرد دەدات (بەدیاریکراوی ڕەنگی زەرد): ﴿صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّـٰظِرِينَ ﴾.

# جەستەی ئەسپ

لـەم دواىوليیانـەدا زانسـتی نـوێ دووپـاتیكردەوە: لـەپێناو هەڵبـژاردنی چاكێتی و ڕەسـەنێتی ئەسـپ، پێویسـتە پشـكنینی ڕواڵـەتیی بـۆ بكرێـت، كۆڵەكـەی ئـەو پشـكنینەش ئەوەیـە ئەسـپەكە ناچـاربكرێت تـا ماوەیـەك غاربدات و لەكاتی ڕاكردن و غارغارێنیدا چاودێری بكرێت.

ئـەم كـارە بـۆ زانینــی سـەلامەتی ئەندامـەكانی جەسـتەی ئەسـپەكە بەسوودە، وێڕای پێ و قاچەكانی و هەمئاهەنگیيان لەگەڵ بەشـەكانی تـری لەشـیدا. لـەپاش غارغـارێن و ڕاكردنەكـە لێـدانی دڵـی ئەسپەكە دەگیرێـت لەگەڵ پشكنینی لاقەكانی، ئەوەش بە مەبەستی زانینی ڕادەی توانـایی بـۆ ڕێ ڕۆیشتن و ڕاكردن و غاردان.

هــەر ئەوەیــە كــە قورئـانی پــیرۆز لــە چـیرۆكی سـولەیمان پێغەمبــەردا (سەلامی خوای لێبێت) ئاماژەی پێداوە. سولەیمان پێغەمبەر پشكنینی بـۆ ئەو ئەسپانە كـرد كـە بـۆ یەكـەمین جـار پێشـانی دران، ئـەو فـەرمانی كـرد ناچاری ڕاكردن و ڕێ ڕۆیشـتن بكـرێن تـا دوورتـرین دووری، لـەدوای لەچـاو ونبوونیان داوای كرد یەكسەر بۆ هەمان جێگا بگێڕدرێنەوە.

دوای ئەوەی ئەسپەكان گەیشتنەوە جـێ، پشـكنینی خوێنبـەرەكانیانی كرد بۆ زانینی لێدانی دڵیان، پاشان ڕوانییە لاقەكان و پێیەكان تاكو لەدوای ئەو جوڵە زۆرەیانەوە حاڵ و كاریگـەربوونیان بزانێـت. ئـەو زانیارییانـە لـەم ئایەتە پیرۆزانەدا ڕوون و ئاشكران، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ إِذْ عُرِضَ

عَلَيْهِ بِٱلْعَشِيِّ ٱلصَّـٰفِنَـٰتُ ٱلْجِيَادُ ﴿٣١﴾ فَقَالَ إِنِّىٓ أَحْبَبْتُ حُبَّ ٱلْخَيْرِ عَن ذِكْرِ رَبِّى حَتَّىٰ تَوَارَتْ بِٱلْحِجَابِ ﴿٣٢﴾ رُدُّوهَا عَلَىَّ ۖ فَطَفِقَ مَسْحًۢا بِٱلسُّوقِ وَٱلْأَعْنَاقِ ﴾ص/٣١-٣٣، واته: کاتێك دەمەوئێوارە ئەو ئەسپە چاکانەی بۆ غەزا ئامادەکرابوون هێنانیان و لەپێش چاویدا نمایشکران. ئینجا وتی: من هەمیشە حەز لەمجۆرە کارانە دەکەم و گرنگیدان بەم ئەسپانە بەخێر دەزانم، لەگەڵ ئەوەشدا نابێت بینەهۆی ئەوەی لە یادی پەروەردگارم بێئاگام بکەن و یادی فەرامۆش بکەم، ئەسپەکان غاریان کرد تا لەچاو ونبوون. لەوەودوا سولەیمان فەرمانیدا بیانگێڕنەوە و کە گەڕانەوە بۆلای دەستی بە ڕان و ملیاندا دەهێنا.

بەمجۆرە دەبینین وەسفی ورد و زانستی و پشکنینی پزیشکی ڤێتێرنەری سەلمێنەری ئەو زانیارییانە دەبن کە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەیان پێدراوە.

# مێـــــش

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٞ فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥٓۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخۡلُقُواْ ذُبَابٗا وَلَوِ ٱجۡتَمَعُواْ لَهُۥۖ وَإِن يَسۡلُبۡهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيۡـٔٗا لَّا يَسۡتَنقِذُوهُ مِنۡهُۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلۡمَطۡلُوبُ﴾ الحج/٧٣، واتە: ئـەی خەڵكینـە! نموونەیـەك هێنراوەتـەوە چاك گوێی بـۆ بگرن! بەڕاستی ئەوانەی لەجیاتی خوا هانا و هاواریـان لێدەكـەن، هـەرگیز ناتوانن تاكە مێشێك دروست بكەن، هەرچەندە بـۆ ئـەو كـارە كۆببنـەوە، و ئەگەر مێشەكە شتێكیان لێ بفڕێنێت ناتوانن پێـی بـزانن و لێـی بسـەننەوە، لەڕاستیدا هـەم بتـەكان لاواز و هـیچ لێنـەهاتوون، هـەم مێشـەكەش لاواز و بێهێزە.

لێكۆڵـەرانی زانسـتی مێرووەكـان دۆزیانـەوە كـە مـێش لیكـەڕژێنی زۆر دەوڵەمەند بە لیكی هەیە و تەنها بـەوەی مێشـەكە خواردنێـك دەخـوات زۆر بەخێرایی و یەكسەر بڕێكی زۆر لیكـی بەسـەردا دەڕژێـت و دەسـتبەجێ بـۆ ماددەیەكی تر دەیگۆڕێت، هەر بۆیە كاتێـك مـێش خواردنێكمـان لێ ببـات و بمانەوێت لێی بسەنینەوە، هەرگیز ناتوانین.

# ماڵی جاڵجاڵۆکە

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿مَثَلُ الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ أَوْلِيَاءَ كَمَثَلِ الْعَنكَبُوتِ اتَّخَذَتْ بَيْتًا وَإِنَّ أَوْهَنَ الْبُيُوتِ لَبَيْتُ الْعَنكَبُوتِ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ﴾العنكبوت/٤١، واتە: نموونـەی ئەوانـەی جگـە لـە خـوای گـەورە کەسـانێکی تـر دەکەنـە پشـتیوانی خۆیـان، وەك نموونەی جاڵجاڵۆکەیەك وایە کە ماڵێك بۆ خۆی سازبکات (بە مـەرجێك) نابودترین و لاوازترین ماڵ ماڵی جاڵجاڵۆکەیە، ئەگەر سەرنجی بدەن و لێـی تێبگەن.

لە ئایەتەکـەدا هـاتووە لاوازتـرین مـاڵ (بیـت العنکبـوت)ـە نـەك (خـیط العنکبوت)، واتە ماڵی جاڵجاڵۆکەیە نەك ڕایـەڵی جاڵجاڵۆکـە، چونکە دەزوو (یان ڕایەڵ)ی جاڵجاڵۆکە (وەك ئەوەی لە زانستدا سەلمێنراوە) بەهێزترە لە دەزوویەکی ڕەقی لـە ئاسـن دروسـتکراو کە هـەمان ئەسـتووریی و درێـژیی هەبێت بە چـوار ئەوەنـدە، بۆیـە لاوازییەکـە لـە مـاڵی جاڵجاڵۆکەدایـە نـەك ڕایەڵەکەی.

مـاڵی جاڵجاڵۆکـە شـوێنگەی تیاچـوون و کوژرانـە بـۆ ئەهلەکـەی، هـەر لەدوای جوتبوون (تلقیح) مێیەکە نێرە دەکوژێت، هەڵبەتە ئەگەر لەدەستی ڕانەکات، هەروەها بێچـوەکانیش ئەگـەر لـە دەسـتی ڕانەکـەن هـەر لـەدوای هەڵهێنان (فقس) یەکسەر دەیانخوات. بەڕاستی ماڵی جاڵجاڵۆکە جوانترین و ڕەوانبێژترین نموونەی زانستییە بۆ خراپیی شوێنگە و بەدیی سەرەنجام.

لـه گۆڤـاری (Kosmos)ی ئـەڵمانی لـه شـوباتی ١٩٨٤دا وتـارێکی زانسـتی (لـه ڕاسـتیدا دۆزینەوەیـەکی زانسـتی) دەربـارەی جاڵجاڵۆکـە بڵاوکراوەتـەوە، تیایـدا هـاتووە: پسـپۆڕەکان ئاشـکرایانکرد کـە مێیـەی جاڵجاڵۆکە هەڵدەستێت بە تـەنینی تـۆڕی جاڵجاڵۆکـەیی و نێـرە ئـەم کـارە ئەنجام نادات. قورئانی پیرۆزیش زۆر پـێش زانسـت باسـی ئـەم ڕاسـتییەی کـردووە، وەك لـە ئایەتـەکەدا هـاتووە: ﴿...كَمَثَلِ ٱلۡعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتۡ بَيۡتٗاۖ...﴾.

وشەی (العنكبوت) بۆ نێرە و مێیەی جاڵجاڵۆکەش هەر بە هەمان شێوە بەکاردێت، بەڵام لە ئایەتـەکـەدا بـاس لـە مێیـەی جاڵجاڵۆکـە کـراوە کـە بـە کارەکە هەڵدەستێت، ئەمەش بە بەکارهێنانی (تاء التأنيث) (کـە ئاشـکرایە لە زمانی عەرەبیدا بۆ ڕەگـەزی مـێ بـەکاردێت) و لـە وشـەی (ٱتَّخَذَتۡ ) دا دیارە.

لەگەڵ ئەوەی لە زمانی عەرەبیدا و لەکاتی قسەکردن دەربـارەی پۆلێك زیندەوەر بەگشتی و بۆ ڕوونکردنەوەی یەکێك لـە سـیفەت یـان نەریتـەکانی ئەو پۆلە دەستەواژەی نێر بەکاردێت، ئەمەش واتە قسەلێکردن یان وەسفی پۆلەکە بەگشتگیری بە (التأنيث) واتە بـە مـێ (وەك لـە ئایەتـەکـەدا دیـارە) تـەنها و تـەنها بـۆ پێویسـتی یـان جیاکردنـەوە و هەڵاوێردنـە. کەواتـە لـە مـەفهومی وشـەی (ٱتَّخَذَتۡ )دا دەردەکـەوێت کـە نێـرەی جاڵجاڵۆکـە تـۆڕ ناتەنێت، بەڵکو مێیە ئەو کارە دەکات.

کۆتـایی ئایەتەکە بـە دەسـتەواژەی (لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ) دێـت، وەك ئامـاژە بـەوەی ئـەم زانیارییـە لەدواییـدا زانسـت ئاشـکرای دەکـات... ئاشکرایشە ئەم نهێنییە بایۆلۆژییانە لەم دواییانەدا زانران.

# وشـــــــتر

خـــوای مـــەزن دەفـــەرموێت: ﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ﴾ الغاشية/١٧، واتە: ئایا سەرنجی وشتر نادەن چۆن دروستکراوە.

کاتێك سەرنجی پێکهاتەی جەستەی وشـتر دەدرێـت، بەڕاسـتی جێگـای سەرسـامی و تێڕامانـە و بەڕاسـتیش مـەزنی پـەروەردگار لـە بەدیهێنانیـدا دەردەکـەوێت لـەو هـەموو نایـابی بەدیهێنانـەی لـە لەشـی ئـەم ئاژەڵـەدا بەدیهێناوە.

وشتر بەوە ناسراوە کە ئارامگرە و بەرگەی کاری نارەحـەت دەگرێـت و دەتوانێـت مـاوەی دووری بیابـان ببڕێـت و بەرگـەی برسـێتی و تینـوێتی دەگرێت، بەڵام بەرگەی سەرمای زۆری زستان ناگرێت.

وشتر دەتوانێت بۆماوەیەکی زۆر بـەبێ خواردنـەوەی ئـاو، مـاوەی دوور ببڕێت، لەو هۆکارانەی وادەکەن وشتر ئەو خەسڵەتەی هەبێت، ئەمانەن:

١. وشـتر دەتوانێـت پلـەی گـەرمی لەشـی خـۆی بگۆڕێـت و دەتوانێـت بەشێوەیەکی سەرنجراکێش بەرگەی بێئاویی بگرێت. لە کەشە گەرمەکاندا و لەژێر بارودۆخی کارکردنی زۆردا زۆربـەی ئـاژەڵان زۆرینـەی ئـەو ئـاوەی لـە لەشـیاندایە لـەرێی دەرکردنـی ئارەقـەوە دەیکەنـە دەرەوەی لەشیان، بـۆ پارێزگاریکردنی پلەی گەرمی لەشـیان، بـەڵام وشـتر لـەجیاتی ئەمـە بـەرۆژ گەرمی دەمژێت و بەشەودا خۆی لێ ڕزگار دەکات.

٢. گەرمی لەشی دەگۆڕێت لە (٩٣ – ١٠٤ پلەی فەهرەنایت) لەدوای نیوەڕۆ... ئەوەش بۆ دابەزاندنی پلەی گەرمی لەشی پێویستی بە دەردانی هەندێك ئارەق هەیە، بەڵام بە بڕێكی زۆر كەمتر وەك لە ئاژەڵانی تر.

٣. كاتێك وشتر لەڕۆژدا قورسایی هەڵدەگرێت، دەبێت بڕێكی زۆر لەئارەق و شێ ون بكات، مرۆڤ بەشێوەیەكی سروشتی ١٠٪ی كێشەكەی لەكاتی گەرمی زۆردا وندەكات، بەڵام وشتر ٢٠٪ی كێشەكەی وندەكات بەبێئەوەی هیچ لە هێز و توانای كەم بكات.

٤. خوای گەورە جۆرێكی تایبەتی خوێنی بەم ئاژەڵە بەخشیوە، بەوەی كە هەندێك لە شلەكەی لە ڕێڕەوەكانی خوێنیدا كەم دەكات، كە بۆماوەی چەند ڕۆژێكی یەكلەدوایەك ئاو نەخواتەوە.

خوێنی مرۆڤ و ئاژەڵەكانی تر بەبێ ئاو جۆرێكیان لێدێت كە نارەحەت لە سووڕی خوێندا دابەش ببن، بەڵام خرۆكە سوورەكانی خوێنی وشتر هێلكەیین و بڕێك لە سۆدیۆم و پۆتاسیۆمیان تێدایە و بەوەش لەو مەترسییە بەدوور دەبێت.

لە مەسەلە و پێكهاتنە سەرسوڕهێنەرەكانی تری بەدیهێنانی وشتر، كەمێكی، ئەمانەن:

قاچەكانی وشتر بە سمێكی ئیسفەنجی كۆتاییان دێت كە لە ڕۆیشتن بەسەر لمدا یارمەتی دەدات. هەر لەشێوەی ئەوانەش دوان لەسەر ئەژنۆكانی پەلەكانی پێشەوەی و دوانیش لەسەر ڕانەكانی و یەك دلەی گەورە لە ژێرەوەی سنگیدا هەن.

وشتر ددانی بەهێز و پووك و قورگ و لایەكانی دەمی بەشانەی داپۆشەری ئەستوور داپۆشراون كە خواردنی زبر كاریان تێناكات، وەك دڕك و ڕووەكە دڕكاوییە زبرەكانی بیابان.

چەند برژانگێك لە دەوری چاوەكانی وشتر هەن كە وەك تۆڕێـك لـە دژی وردە خۆڵ پارێزگاری لە چـاوەكانی دەكـەن. ئەگـەر لـەكاتی ڕۆیشـتنی بـە بیاباندا گەردەلوول و تـەپوتۆز هـەڵیگرت... لـە هەمانكاتـدا دەتوانێـت لـەم تۆڕەیەشـەوە ببینێـت، چـونكە وەك مـرۆڤ لـەكاتی تـەپوتۆزدا چـاوەكانی داناخات.

هەروەها لـوتی یارمـەتی دەدات بـۆ ژیـانی لـە بیابانـدا، چـونكە لـەكاتی گەردەلوولەكانــدا بۆنـــەوەی خـــۆڵ نەچــێتە نێویــەوە دەروازەكانیـــان دادەخات... ئەگەر تینوی بوو، دەتوانێت ئاوی سوێر بخواتەوە بەبێنـەوەی زیانی پێبگات.

كۆئەندامەكانیشی خێـرا هەسـت بـە بارودۆخـە ناهـەموارەكان دەكـەن و خۆیانی لەگەڵ ڕادێنن، گورچیلە بەرێـژەیی دەردانـی میـز كـەم دەكاتـەوە، هەروەها پلەی گەرمی لەشی و پێستەكەی لـەكاتی تینوێتیـدا دادەبـەزێنێت تاكو بەهەڵمبوونی ئاو لە لەشیدا كەم ببێتەوە.

# سەربڕینی ئاژەڵ پێش گیاندەرچوونی

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَنْ تَسْتَقْسِمُوا بِالْأَزْلَامِ ذَلِكُمْ فِسْقٌ﴾ المائدة/٣، واتە: گۆشتی مردارەوە بوو، خوێن و گۆشتی بەراز لێتان حەرام کراوە، هەروەها ئەو ماڵانەش کە سەردەبڕدرێن و ناوی جگە لە خوای لەسەر دەبرێت، ماڵاتی خنکاویش، ئەوەش کە بە ئازار و لێدان مرداردەبێتەوە، ئەوەش کە لەشوێنێکی بەرز بەردەبێتەوە، یان دەکەوێتە ناو بیرێکەوە و مردار دەبێتەوە، ئەو ماڵانەش کە بە شۆقی ماڵاتێکی تر مردار بووبێتەوە، ئەوانەش کە درندەی کێوی پەلاماری دابن و لێی خواردبن، مەگەر فریای چەقۆ کەوتبن، هەروەها ئەو ماڵاتانەی کە لە شوێنی تایبەتیدا بۆ بتەکان سەر دەبڕدرێن، ئەوانەش هەر حەرامن.

لە خوارەوە حیکمەتی سەربڕین و حەرامکردنی ئەو جۆرانە باس دەکەین کە لە ئایەتە پیرۆزەکەدا ئاماژەی پێدراوە، لەژێر ڕۆشنایی ئەو زانیارییانەی زانستی نوێ پێیگەیشتووە.

# گۆشتی مردارەوە بوو و خوێن

گۆشتی مردارەوەبوو کۆگایەکە بۆ میکرۆب و نەخۆشییە کوشندەکان... ئایا ئەگەر گرامێك خوێن یان گرامێك گۆشت لە شوێنێکی دیار و ئاشکرادا دابنێین و بمانەوێت دوای سێ یان چوار کاتژمێری تر بەکاری بێنین، هیچ زیانێکی دەبێت؟

بەدڵنیاییەوە زیانێکی گەورە بەر بەکارهێنەرەکەی دەکەوێت. لەوانەیە میکرۆبی نەخۆشی لەڕێی چەقۆ بەکارهاتووەکەوە بۆ خوێنەکە گوێزرابێتەوە، یان لەڕێی هەوای دەوروبەریەوە. ئەگەر ژمارەیەك میکرۆب بەهەر ڕێگایەك بۆ خوێنەکەی گوازرانەوە، ئەوا هەر تاکە میکرۆبێك بەشێوەیەکی ئەندازەیی هەموو نیو کاتژمێرێك چەند هێند دەبێتەوە، هەر میکرۆبێك دەبێتە دوان و... خۆئەگەر واماندانا هەزار میکرۆب بۆ ئەو یەك گرام خوێنە گوازراونەتەوە، ئەوا دوای نیوکاتژمێر دەبێتە دووهەزار، دوای کاتژمێرێك دەبنە چوار هەزار و پاش کاتژمێر و نیوێك دەبنە هەشت هەزار و پاشان ژمارەیان زیاددەکات بۆ شانزەهەزار، دوای تێپەڕبوونی دوو کاتژمێر، پاش سێ کاتژمێریش ژمارەی میکرۆبەکان دەبنە شەست و چوار هەزار کە بەتەواوی ئەو گرام خوێنە داگیر دەکەن. ئەمە سەرەڕای ئەو ڕاستییەی کە هەندێك لە جۆرەکانی بەکتریا وەك بەکتریا چیلکەییەکان (زۆبەشیان مەترسیدارن) زۆر خێراتر لەم نموونەیە لە خوێندا گەشەدەکەن.

ئەوەش زانراوە خوێنی ئاژەڵەکە ڕاستەوخۆ دوای مرداربوونەوەی ژمارەیەکی زۆر میکرۆبی تێدەچێت (لەبەرئەوەی لاشەی ئاژەڵەکە بەرگری نامێنێت) و بەوەش پیس و ژەرەرمەند دەبێت بۆ تەندروستی مرۆڤ، ئەگەر خواردیەوە، یاخود لە جێگایەك هەڵی بگرێت و دواتر بیخواتەوە.

## گۆشتی بەراز

میکرۆبێك هەیە بەناوی (بەرسینا) کە لە گۆشتی بەرازدا هەیە و لە پلەی گەرمی زۆر نزمدا (-١٠پلەی پەتی) دەژی. زۆربەی ئەورووپییەکان گرفتاری ئەم میکرۆبەن. زۆرینەی توشبوانیش بە نەخۆشییەکانی بربڕەی پشت و جومگەکان هۆکاری نەخۆشییەکانیان ئەم میکرۆبەیە.

لێکۆڵینـــەوەکان دەریانخســـتووە ئـــەم بەکتریایـــە لـــە ئـــاو و زۆربـــەی خواردنەکانـــدا هەیـــە، بـــەڵام کاتێـــك مـــرۆڤ دەیخـــوات بـــە ئەنـــدازەی ئـــەو بەکتریایەی لەدەمی بەرازدایە بەهێز نییە، چونکە دەمـی بـەراز ژینگەیـەکی زۆر گونجاوە بۆ گەشەکردنی ئەم بەکتریایە.

بـــەراز بـــە پەنســـلین و دژە زیندەگییـــەکان (المضـــادات الحیویـــة)ی زۆر چارەسەر دەکرێت، لەگەڵ ئەوەشدا هـەر هـەڵگری ئـەم بەکتریایـە... ڕۆژ لـــەدوای ڕۆژیـــش نەخۆشـــی زیـــاتر لـــەو نەخۆشـــییانە دەدۆزرێتـــەوە کـــە هۆکارەکانیان خواردنی گۆشتی بەرازە و لەپێشتردا نەزانرابوون.

## ئاژەڵی خنکاو

لـەم دواییانـەدا پەیوەنـدی نێـوان ئـەو نەخۆشـییانەی ئـاژەڵی خنکـاو هەڵگریەتی لەگەڵ تەندروستی مرۆڤدا دۆزرایەوە. بەدرێژایی ژیانی ئاژەڵەکە دیواری ڕیخۆڵە ئەســتوورەی ئـاژەڵ وەك بەربەسـتێك کاردەکـات لەبـەردەم گوێزانەوەی میکرۆب لە ڕیخۆڵەوە (کە پاشەڕۆی تێدایە) بۆ لەشی ئـاژەڵ و خوێنەکـەی. دیـواری نـاوەوەی ئـەم ڕیخۆڵانـە نـاهێڵن میکـرۆب بـۆ لەشـی

ئاژەڵەکە بگوێزرێتەوە، هەروەك لەناو بۆرییە خوێنەکاندا دیوارێکی تر هەیە ناهێڵێت میکرۆب بۆ خوێنی ئاژەڵەکە بگوێزرێتەوە.

کاتێك ئاژەڵێك دەخنکێت بەهێواشی مردار دەبێتەوە، مەترسی ئەم مرداربوونەوە هێواشە لەوەدایە کە دیواری داپۆشەری ناوەوەی ریخۆڵە بە پلەبەندی بەرگرییەکەی وندەکات و بەمەش میکرۆبە زیانبەخشەکان دیواری ریخۆڵەکان دەبڕن و بەرەو خوێن و گۆشتی دەوروبەری دەچن. پاشان ئەم میکرۆبانە بەهۆی سووڕی خوێنەوە بۆ هەموو بەشەکانی لەش دەگوێزرێنەوە، چونکە هێشتا ئاژەڵەکە مردار نەبووەتەوە... هەروەها ئەم میکرۆبانە لە دیواری بۆرییەکانی خوێنەوە بۆ گۆشت دەچن بەهۆی کەمی بەرگری دیوارەکانی بۆرییەکانی خوێنەوە ئەمەش وادەکات وەك شوێنگەیەکی گەورەی ئەم میکرۆبانەی لێبێت. لەدواییدا ئەم میکرۆبە زۆربوانەش تەندروستی ئاژەڵەکە هەتاکو مرداربوونەوەی بەتەواوی دەشێوێنن. مرداربوونەوەشی لەم حاڵەتەدا، واتە بوونی مەترسییەکی گەورە لە لەشی ئەم ئاژەڵە خنکاوەدا.

## ئەو ئاژەڵەی بەئازار و لێدان مردار دەبێتەوە

ئایا لێکچوون لەنێوان مەترسی مرداربوونەوەی ئاژەڵێك کە خنکاوە لەگەڵ مرداربوونەوە بە لێدان هەیە؟!

بەڵێ... ئەو ئاژەڵەی کە لێ دەدرێت توشی مرداربوونەوەیەکی هێواش دەبێت بەتەولوی وەك خنکاو، بۆیە هەمان ئەو حاڵەتەی بەسەر ئاژەڵە خنکاوەکەدا دێت توشی ئەمیش دەبێت.

زیاد لەوەش لێدان دەبێتەهۆی شێواندن و پەرتکردنی بۆرییەکانی خوێن لـە شـوێنی لێدانەکـەدا، هـەروەها خانـەکانیش پـەرت و پارچـە دەکـات و بەمەش پێکهاتەی خوێن و خانەکان تێکەڵ دەبن و کارلێک لـەنێوان مـاددە ژەهراوییە زیانبەخشەکاندا ڕوودەدات. لەبەرئەوە لە شوێنی پیاکێشانەکەدا تێبینی ئاوسان (تورم) دەکرێت، ئەمـەش هۆکـاری ئـەو کارلێکـە کیمیاییـە زیانبەخشانەیە کە دەبنە دروستکەری ماددەی ژەهـراوی لەگـەڵ قڵیشـان و داماڵینی پێستی ئاژەڵەکە بەهۆی لێدانەکەوە. بـەمجۆرە ئـەو ئاژەڵـەی بـە لێـدان مرداردەبێتـەوە دەبێتـە کانگایـەک بـۆ میکرۆبـی زیانبـەخش و بـۆ تەندروستی مرۆڤیش جێی مەترسی دەبێت.

## ئەو ئاژەڵەی لە شوێنێکی بەرزەوە دەکەوێتە خوارەوە

حاڵـەتی ئـەو ئاژەڵـەی بـەم ڕێگایـە مرداردەبێتـەوە وەک حاڵـەتی ئـەو ئاژەڵەیە کە بەلێـدان مـردار دەبێتـەوە، لـە شـوێنی کەوتنـەخوارەوەدا ئـەو تێکشکان و پەرتبوونە ڕوودەدات و دەست دەکـات بـە گیـان دەرچـوونێکی هێـواش... تەنانـەت ئەگـەر دوای کەوتنـە خـوارەوەش ڕاسـتەوخۆ مـردار ببێتەوە ، میکرۆب بەخێرایی هەموو لاشەکەی داگیردەکـات، بۆیـە دەبینـین بۆگەنی (عفونـات) بـە خێرایـی لـە لاشـەی ئـەم ئاژەڵـەدا زیاددەکـات، وەک بەڵگە لەسەر بوونی میکرۆب و زیندەوەری وردی مەترسیدار تیایدا.

## ئەو ئاژەڵەی بە شۆقی ئاژەڵێکی تر مرداردەبێتەوە

دەگونجێت ئاژەڵ لە ئەنجامی شەڕەشۆقی نێوانیانەوە مردار ببنەوە. ئایا هیچ مەترسییەك هەیە لە خواردنی گۆشتی ئەو ئاژەڵەی بەم ڕێگایە مردار دەبێتەوە؟

مرداربوونەوەی ئاژەڵ بەم ڕێگایە وەك مرداربوونەوەیە بە ڕێگای لێدان، بەڵکو مەترسیدارتریشە... بەزۆریی ئاژەڵ کاتێك شۆق لە ئاژەڵێکی تر دەدات، شاخەکان دەچن بەناوچەی سکی ئاژەڵە لێدراوەکەدا، بەتایبەت ڕیخۆڵەکانی. لەوکاتەدا شاخی پیس و میکرۆباویی دەچێتە خوێن و ڕیخۆڵەکانی ئەوەی بەرامبەری، دیارە خوێنیش بەلاشەیدا بڵاودەبێتەوە، لەدوای ئەوە ئاژەڵە شۆق لێدراوەکە مرداردەبێتەوە. خواردنی گۆشتی ئاژەڵەکە لەم حاڵەتەدا مەترسییەکی ڕاستەقینە لەسەر تەندروستی مرۆڤ دروستدەکات.

## ئەو ئاژەڵەی دڕندەی کێوی پەلاماری دابێت و لێی خواردبێت

ئاشکرایە چڕنوکی دڕندە (هەروەها کەڵبە و لیکی زۆربەی دڕندەکان) پڕیەتی لە میکرۆب، بۆیە کاتێك دەیکات بە لەشی ئاژەڵێکی تردا، ئەو میکرۆبانە دەگوێزرێنەوە بۆ خوێنەکەی و پاشان ئاژەڵەکە بەهێواشی مرداردەبێتەوە، بەمجۆرەش لاشەی ئاژەڵە مردارەوەبووەکە دەبێتە کانگایەکی میکرۆب و زیندەوەرە زۆر وردە زیانبەخشەکان. ئەمە جگە لەو

حاڵەتەی وەك لە ئایەتەکەدا هاتووە ﴿إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ﴾ واتە: مەگەر فریای چەقۆ کەوتبن.

ئەگەر ئاژەڵێك توشی یەکێك لەو حاڵەتانەی پێشوو بوو، بەلام هێشتا مردارنەبووبووەوە و پێش مرداربوونەوەکەی سەربڕدرا ئەوا لاشەکەی لەو ماددەیە ڕزگاری دەبێت کە دەبێتەهۆی گوێزرانەوەی میکرۆب بۆی، ئەویش خوێنە... چونکە خوێن ئەو شلە زیندەگییە گرنگەیە لە لەشی هەر زیندەوەرێکدا کە لەتوانایدایە بەرگری ملیۆنان میکرۆب و مشەخۆر (طفیلیات) بکات، بەوەی کە خڕۆکەی سپی و دژە تەنەکانی تێدایە، مادام ئەو زیندەوەرە زیندوو بێت و لە پلەی گەرمی سروشتیدا بێت، بەلام کاتێك ئاژەڵەکە مرداربووەوە و خوێنیش لە سوڕانەوە وەستا، ئەوردەمە میکرۆبەکان بەبێ بەرگری دەمێننەوە، بۆیە باشترین ڕێگا لەم کاتەدا دەرکردنی خوێنەکەیە لە لەش لە زووترین کاتی گونجاودا.

شایانی باسە کاتێك کە ئاژەڵ سەردەبڕدرێت و خوێنەکەی بە تەواوی لە لاشەی دەردەچێت، ماسولکەکانی ئاژەڵەکە کرژ دەبن و ڕادەی ترشێتی نێو گۆشتەکە زیاددەکات و PH کەم دەبێتەوە، ئەمەش وادەکات ئەگەر پێشتریش میکرۆب (بەکتریا) لە گۆشتەکەدا هەبووبێت (بۆنموونە ئەگەر ئاژەڵەکە نەخۆش بووبێت) ئەو بەکتریایانە لەناو بچن.

# بەزەیی بە ئاژەڵاندا

گەر ئاژەڵمان سەربڕی و خوێنهێنەرەکانیمان بڕی و دوایش خوێنەکەی ڕژیشت، ئایا ئاژەڵەکە هەست بە ئازار دەکات؟

زانست ئەو ڕاستییەی دۆزییەوە کە سەنتەرەکانی هەستکردن بەئازار لەکار دەوەستن ئەگەر کرداری خوێن بۆچوونیان بۆ ماوەی تەنها سێ چرکە وەستا، چونکە بە بەردەوامی پێویستی بە ئۆکسجینی خوێن هەیە.

لەوانەیە کەسێك بڵێت: چۆن دەڵێین ئەو ئاژەڵە هەست بە ئازار ناکات لەگەڵ ئەوەشدا کە دەبینین لەسەر برینەکەدا هەڵبەز و دابەز دەکات و دەجوڵێت و لوول دەخوات؟!

ئەم جوڵە تایبەتییانەی ئاژەڵەکە هۆکارەکەی ئەوەیە کە کۆئەندامی دەماری تا ئەوکاتەش هەر زیندووە، کە تا ئەوکاتە زیندوویەتی تێدایە و تەنها ئاگاهی (وعی) لەدەستداوە، لەم حاڵەتەدا هێشتا گەرووی نەبڕدراوە و کۆئەندامی دەمار بە زیندوویەتی ماوەتەوە و بەمە ژیانیش لە ئاژەڵەکەدا دەمێنێتەوە.

بەڵام ئەوەی کە ڕوودەدات لە کرداری سەربڕین بە شێوازی موسڵمانان ئەوەیە کە کۆئەندامی دەمار هەڵدەستێت بە ناردنی ئاماژە لە مۆخەوە بۆ دڵ بەوەی داوای خوێنی لێدەکات، چونکە خوێنی پێناگات، بەتەواوی وەك ئەوەی بانگ لە دڵ بکات و بڵێت: خوێنم لێ بڕاوە! بەپەلە خوێنمان بۆ بنێرە، ئەی ماسولکەکان! یارمەتی دڵ بدەن بەخوێن، ئەی جەستە! خوێن دەربکە، چونکە مۆخ لە مەترسیدایە.

لەوکاتـەدا ماسـولکەکان یەکسـەر پەسـتان دروسـتدەکەن و جوڵەیـەکی توند لە هەناو و ماسولکە دەرەکی و ناوەکییەکاندا ڕوودەدات، پەسـتانێکی تونـد دروسـتدەکات و هـەموو ئـەو خوێنـەی تێیدایـە دەنێرێتـەوە بـۆ دڵ، پاشـان دڵ دوای پڕبـوونی بـەخوێن، بـەخێرایی ڕۆڵـی خـۆی دەگێڕێـت و ڕاسـتەوخۆ خوێنەکـە بـۆ مـۆخ دەنێرێـت، بـەڵام ئاشـکرایە کـە خوێنەکـەی پێناگات و دەچێتە دەرەوەی لاشەی ئاژەڵەکە، بۆیـە ئاژەڵەکـە جوڵەیـەکی تایبەتی تێدا دروستدەبێت. بـەمجۆرە بـە بـەردەوامی پـاڵ بـە خوێنەکـەوە دەنرێت تـاکو لاشـەی ئاژەڵەکـە بەتـەواوی لـەخوێن ڕزگـاری دەبێـت، واتـە ئەگەر بەڕێگایەکی دروسـت ئـاژەڵ سـەربڕدرا، ئـەوا تـەنها بـۆ مـاوەی سـێ چـرکە ژیـانی تێـدا دەمێنێـت و ئـەو جوڵـە و هەڵبەزینـەی لـە شـوێنەواری مانەوەی ژیانـە لـە کۆئەنـدامی دەماریـدا، ئاژەڵـە سـەربڕدراوەکەش بـەهیچ شێوەیەك هەست بە ئازار ناکات.

# زمانی ئاژەڵان

خــوای گــەورە دەفــەرموێت: ﴿وَحُشِرَ لِسُلَيْمَانَ جُنُودُهُ مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ وَالطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ (١٧) حَتَّى إِذَا أَتَوْا عَلَى وَادِ النَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَا أَيُّهَا النَّمْلُ ادْخُلُوا مَسَاكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَانُ وَجُنُودُهُ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾النمــــل/١٧-١٨، واتە: هەرچی سەرباز و لەشکری سولەیمان هەبوو لە پەری و مرۆڤ و باڵندەکان کۆکرانەوە و نمایشیان کرد بە ڕیز و ڕێکوپێکی هەموویان بە سەرەتا و کۆتاییان یەکیان گرت. هەتا گەیشتە دۆڵی مێرووڵە، مێرووڵە مێیەیەك (هاواری کرد و) وتی: ئەهای مێرووڵەینە، بچنە ماڵ و کون و کەلەبەرەکانتانەوە نەوەکو سولەیمان و سەربازانی پێشێلتان بکەن، لەکاتێکدا هەستتان پێناکەن.

﴿فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍ بِنَبَإٍ يَقِينٍ (٢٢) إِنِّي وَجَدتُّ امْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ﴾النمل/٢٢-٢٣، واتە: (سولەیمان) زۆر چاوەڕێی نەکرد (پەپوو پەیدابوو، یەکسەر هات و نیشتەوە و) وتی: ئەوەی من پێم زانیوە تۆ پێتنەزانیوە، من لە وڵاتی سەبەئەوە هەواڵێکی ڕاست و دروستم بۆ هێناویت!! بەڕاستی من بۆم دەرکەوت ئافرەتێك فەرمانڕەواییان دەکات و بە هەموو جۆرە دەسەڵات و ناز و نیعمەتێکی پێبەخشراوە، تەختێکی پاشایەتی گەورەشی هەیە، بینیم خۆی و نەتەوەکەی لەجیاتی خوا سوژدە

بـۆ خـۆر دەبـەن، شـەیتان کـار و کـردەوەی چـەوتیانی بـۆ ڕازاندونەتـەوە، بەوهۆیـەوە ڕێبـازی ڕاسـت و دروسـتی لێگرتـوون، بۆیـە ئـەوان ڕێنمـوویی وەرناگرن.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ﴾النمل/١٦، واتە: (سولەیمان) وتی: ئەی خەڵکینە ئێمە فێری زمانی باڵندە کراوین.

ئەم ئایەتانە ئاماژە بەوە دەدەن کە ئـاژەڵان زمـانی وتووێـژیان هەیـە، هەر کۆمەڵە ئاژەڵێك زمانێکی گفتوگۆی تایبەتی خۆیانیان هەیە.

هەنگ هۆکاری قسەکردنی خۆی هەیە لەڕێی سەمایەکی بازنەییەوە وەك ڕێنمـایکردنی تاکـەکانی تـری کۆمەڵەکـەی بـۆ شـوێنی گوڵـەکان لەگـەڵ دیاریکردنی وردی دووریی گوڵەکان.

مریشـکی دارسـتان (دجاجـة الغابـة) کـەمێك لـە تاکـەکانی کۆمەڵەکـەی دوادەکەوێت، بۆئـەوەی هێلکەکـەی بکـات، کاتێـك تـەولودەبێت بـە دەنگـی بەرز دەگارێنێت و کەڵەشـێرەکەش بـە قوقەیـەکی بـەرز وەڵامـی دەداتـەوە تاکو شوێنەکەی پێبڵێت.

بۆزەرەوەی (ئاشکراکاری) هـەنگوین کـە باڵندەیەکـە، هـەرکات شـوێنی هەنگوینی زانی دەنگێکی تایبەت دەردەکات، ئیتر سەرجەم ئاژەڵەکانی ئەو ناوە دوای دەکەون تاکو هەنگوینەکە بخۆن.

جریوەی چۆلەکەکان ئاماژەیەکی ئاشکرایە لەسەر گفتوگۆ و ئاخـاوتنی چۆلەکەکان لەنێوان خۆیاندا.

تێبینی کراوە مێرووله کە شوێنی خواردن دەدۆزێتەوە، دەگەڕێتەوە بـۆ خانەکەی، پاشان زۆر نابات بە ژمارەیەکی زۆر مێروولەی هاوڕێیەوە بـەرەو شوێنی خۆراکەکە دەڕۆن، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر بـوونی گفتوگۆ و لێـك حاڵی بوونیان.

یەكێك لە زانایان ئاشكرایكرد، ئەو مێروولەیەی جێگای خواردنەكە دەدۆزێتەوە، كاتێك مێروولەیەكی تر دەبینێت بە پەلەكانی (دەستیان) دەیهێنن بە یەكدا، بەمجۆرە زانیارییەكان بۆ مێروولەكەی تر دەگوێزێتەوە... وێڕای ئەوەش مێروولە دۆزەرەوەكە لە ڕژێنی (شرجیة)ەوە ماددەیەكی بۆندار دەردەدات كە ڕاستەوخۆ لەو جێگایەی خواردنەكەی لێیە درێژدەبێتەوە بۆ ئەو جێگایەی كۆمەڵەی مێروولانی لێ دەژین!

# ئاژەڵانیش وەك مرۆڤ گەل و نەتەوەی جیاوازیان هەیە

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم﴾الأنعام/٣٨، واتە: هیچ زیندەوەر و گیانلەبەرێك نییە بەسەر زەویدا بڕوات و هیچ باڵندەیەك بە باڵەكانی بفڕێت و ئەوانیش ئوممەت و گەلێك نەبن وەك ئێوە.

ئایەتەكە ئاماژە بەوە دەدات كە ئاژەڵانیش گـەل و كۆمـەڵی جیاوازیـان هەیە، هەر گروپ و كۆمـەڵێك زمـانێكی تایبـەتی لێـك تێگەیشـتنیان هەیـە. پێشـتر خـەڵك بڕوایـان وابـووە ئـاژەڵان تـەنها بوونەوەرگـەلێكی زینـدوون، دەخۆن و دەخۆنەوە، بەڵام بەبێ زیری و بەبێ ڕێكخستنی كاروباریان.

وشەی (دابّة) لـە ئایەتەكـەدا سـەرجەم زینـدەوەران دەگرێتـەوە كـە لـە ئاودا دەژین، وەك ماسـی و خشـۆك و مێروەكـان، هـەروەها باڵنـدەكانیش بەتایبەت تر، لەگەڵ ئەوەی كە زیـاتر لـە دوو ملیـۆن پـۆلی ئـاژەڵان لەسـەر زەوی هەیە... زانایان لێكۆڵینـەوەیان لەسـەر ڕەفتـاری ئـاژەڵان كـردووە و بوونی خێزان و كۆمەڵی ڕاستەقینەی ئاژەڵانیان ئاشكراكردووە، گـەورەترین بەڵگەش لەسەر ئەوە بوونی كۆمەڵەی مێروەكانە.

هـەر نەتەوەیـەك ڕەنگ و سروشـتی تایبـەتی ژیانیـان هەیـە جیـاواز لـە نەتـەوەكانی تـر، وێـڕای ئـەوەش ئـەو نەتەوانـە لەگـەڵ یەكتریـدا دەژیـن بێئەوەی دەستدرێژی بكەنە سـەر یـەكتر. هـەر تاكێـك لـەو نەتەوانـە ڕەنگ و تەمەنی دیاریكراوی هەیە، گەر تەمەنی مێش لەبری چەند هەفتەیـەك چـەند

ساڵێك بوایە، ئەم نەتەوەیە دەریا و وشكانی و كەشیان داگیر دەكرد و لەگەڵیدا ژیان نەدەما!

گەر ژمارەی باڵندەكان كەم بكات (لە ژمارەی ئێستا)، ژمارەی مێرووەكان زیاد دەبێت و ئەوەش دەبێتەهۆی خواردنی سەرجەم ڕووەكەكان و لەناوچوونی كێڵگەكان و دوابەدوای ئەوەش نەمان و تیاچوونی ژیانی سەر زەوی.

گەر ژمارەی مارەكان كەم بكات، ژمارەی مشك زیاددەبێت و بەوەش بەروبوومی كشتوكاڵی لەناودەچێت... بۆیە هەر نەتەوەیەك قەبارە و ژمارەیەكی حسابكراوی هەیە لای خوای مەزن، تاكو هاوسەنگی بەردەوام بێت.

یەكێك لەو مەسەلانەی گرنگە لێرەدا بە كورتی لێی بدوێین ڕۆژووە لای ئاژەلان:

١. دووپشك دەتوانێت سێ ساڵی دوابەدواییەك هیچ نەخوات.

٢. بۆقەكان دەتوانن یەك ساڵی تەولو بەڕۆژوو بن.

٣. مێشوولە دەتوانێت ماوەی ٣٥كاتژمێر بەبێ خواردن هەڵبكات.

٤. تیمساح لەتوانایدا هەیە دوو ساڵ ئاو نەخواتەوە، كوڕیەكەشی دەتوانێت هەشت مانگ ئەوە بكات.

٥. جاڵجاڵۆكەی تونێلی (نفقی) بەوە ناسراوە كە زۆربەی ژیانی بەبێ خواردن بەڕێ دەكات؟! بەشێوەیەك كە كۆی تەمەنی (٣٠٥ڕۆژ)ـە دەتوانێت (٢٠٨) ڕۆژیان بەبێ خواردن بژی، لەو ماوەیەشدا ڕێژەی چالاكییەكانی لەشی (میتابۆلیزم) بۆ (١/٤٠)ی ئاستە بنەڕەتییەكەی دادەبەزێت.

٦. وشتر دەتوانێت مانگێكی تەواو بەبێ خۆراك و دوو هەفتە بەبێ خواردنەوەی ئاو بژی.

# بەرهەمهێنانی شیری ماڵات
# لەنێوان گژوگیای هەرسکراو و خوێندا

پــەروەردگار دەفــەرموێت: ﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِ مِن بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَائِغًا لِّلشَّارِبِينَ ﴾النحـل/٦٦، واتــە: بەڕاسـتی لـە بوونی ماڵات و (زیندەوەرلنی جۆرلوجۆردا) پەند و ئامۆژگاری هەیە بۆتـان و جێگای سەرنج و تێڕامانە، لەنێوان ئەو شتانەی کە لـە سـکیاندا هەیـە، لـە گـژوگیای هەرسـکرلو و خوێنـدا، شـیرێکی پـاك و بێگـەرد و خـۆش و بـەتام بەرهەم دەهێنین بۆ ئەولنەی دەیخۆنەوە.

ئەم ئایەتە پیرۆزە سەرنجمان بۆ داهێنانکاریی خوای مەزن ڕادەکێشـێت لە بەدیهێنرلوانی و نایابی دروسـتکراوەکانیدا. وەهـایکردووە شـیر لـەنێوان گژوگیای هەرسکراو (پاشماوەی خۆراکی هەرسکراو) و خوێندا بەرهەم بێت.

دۆزینەوەکانی زیندەوەرزانی نوێ لەبارەی فرمانی ئەندامەکانی لەشـەوە ڕوونی دەکەنەوە کە کۆئەندامی هەرسی ئاژەڵان، خـۆراك هـەرس دەکـات و شلە دەمژێت و دەیگوازێت بـۆ خـوێن کـە بەبۆرییـە خوێنەکانـدا ڕێ دەکـات لەپێناو خۆراك پێدانی سەرجەم خانەکانی لەشی ئاژەڵەکە.

بڕێك لەو خوێنە بـۆ گـوانی ئاژەڵەکـە دەچـێت، ڕژێنـەکانی شـیر (الغـدد اللبنية) لە گوانەکەدا ڕەگەزە پێویستەکانی پێکهاتنی شیر پوختە دەکەن و پاش ئەوەی شلەی تایبەتی تێدا بـەکاردێنن، شـیر بەرهـەم دێـت کـە تـام و ڕەنگی تایبەتی خۆی هەیە.

بـەمجۆرە، زانسـتی نـوێ دەیسـەلمێنێت کـە شـیر لـەنێوان گـژوگیا و پاشمـاوەی خـۆراکی هەرسـکراو و خوێنـەوە دەردەچێت، شـیرێکی پـاك و خۆش و بەتام.

بەڕاسـتی ئـەوە کردارێکـی سـەیر و سەرنجڕاکێشـە، بـە بـەردەوامی لـە هەموو چرکەیەکدا لە لەشی ئاژەڵە شیردەرەکاندا ڕوودەدات.

خـواردنی ئاژەڵەکـە لـە گـژوگیا و دانەوێڵـە، لـەدوای چـەند کردارێکـی تایبەتییەوە دەگۆڕێن بۆ شیر، کە بۆ مرۆڤ باشترین خۆراکە.

# هـــەنـــگ

هەنگ دەفڕێت، کاردەکات، گوڵاو دەمژێت، خانەکەی دروستدەکات، هەموو ئەوە بەویست و وەحی خوای گەورەیە.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِى مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴾النحل/٦٨، واتە: پەروەردگاری تۆ (ئەی مرۆڤ) نیگا و ئیلهامی بۆ هەنگ کردووە کە جێگا لە کون و کەلێنی چیاکاندا بۆخۆی سازبکات، هەروەها لە کەلەبەری درەختەکان و لەو شوێنانەش کە مرۆڤ بۆی ئامادە دەکات.

پاشان لێکۆڵینەوە زانستییە نوێیەکان گەیشتنە ئەوەی کە خوای مەزن وەها لە هەنگ دەکات بۆ مژینی گوڵاوی گوڵەکان بفڕێت، هەزاران مەتر لە خانەکەی دووردەکەوێتەوە و دووبارە بۆی دەگەڕێتەوە بەبێ ئەوەی هەڵە بکات و بچێتە خانەیەکی ترەوە. وێڕای ئەوەی خانەکانی نێو پوورەی هەنگ لەتەنیشت یەکترەوەن... ئەمەش لەبەرئەوەیە کە خوای گەورە جۆرە هەستێکی کارەبایی موگناتیسی لە جەستەیدا خوڵقاندووە.

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ ثُمَّ كُلِى مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسْلُكِى سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا ۚ يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾النحل/٦٩، واتە: پاشان (فێرمان کردووە کە) لە هەموو بەروبووم

و (شـیلەی گـولآن و شـتی بەسـوود) بخـوات و پێمـان ڕاگەیانـدووە: ئـەو ئەخشانەی کە پەروەردگارت بۆی کێشاویت بە ملکەچییەوە ئەنجامی بدە، جا لەناو سکی ئەو هەنگانـەوە شـلەیەکی ڕەنـگ جیـاواز دێتـە دەرەوە کـە شـیفای تێدایـە بـۆ (زۆر نەخۆشـی) خـەڵکی (سـەرەڕای تـامی شـیرین و خۆشی)، بەڕاستی ئا لەمەشدا بەڵگە و نیشانەی بەهێز هەیە بۆ کەسانێك بیربکەنەوە.

لـەدوای ئـەوەی هـەنگ گـوڵاوی گوڵـەکان لـەنێو لەشـە بچـووکەکەیدا کۆدەکاتەوە، ئیدی لەشە بچووکەکەی دەبێتە کارگەیـەك و ئـەو گـوڵاوە بـۆ شلەیەکی ئەوتۆ دەگۆڕێت کە شیفای بۆ مرۆڤ تێدایە.

ئـەو وەسـفەی قورئـانی پـیرۆز کـە هـەنگوین شـیفای بـۆ مـرۆڤ تێدایـە، ڕاسـتییەکی زانسـتییە و شـیکارییە زانسـتییەکان بـۆ ئـەم ماددەیـە ئـەو ڕاستییەیان سەلماندووە... هەموو زانایـان کـۆکن لەسـەر ئـەوەی هـەنگوین شیفای بۆ مرۆڤ تێدایە.

هەنـدێك لەوانـەی تەمـەنی خۆیـان بـۆ لێکۆڵینـەوەی ژیـانی مێرووەکـان تـەرخان کـردووە، گەیشـتوونەتە ڕاسـتیگەلی سـەیر و نـامۆ کـە دروسـتی زانیارییەکانی نێو ئایەتەکـە دەسـەلمێنن... چـەندین پـۆلی هـەنگ هـەن لـە شـاخەکان نیشـتەجێن، لـە ئەشـکەوتی جیاکاندا پەناگـەی خۆیـان بونیـات دەنـێن. چـەندین جـۆری تـر لـەنێو کلـۆری درەختەکانـدا پەناگـە دروسـت دەکەن، لەنێو ئـەو کونانـەی لەقـەدی درەختەکانـدا هـەن. کـاتێکیش مـرۆڤ ویستی سوود لە هەنگوین وەربگرێتماڵیی کرد و خانـەی تایبـەتی لـە قـوڕ یان تەختە بۆ دروست کرد تاکو تیایدا بمێنێتەوە و بژی.

بەمجۆرە ئایەتەکە بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە چۆن ئەم مێروانە بەئیلهامێکی خوایی، پەناگەی خۆی بونیات ناوە و دەنێن، هەر لە دێرزەمانەوە تاکو ڕۆژگاری ئەمڕۆ.

زانستی نوێ سەلماندوویەتی، هەنگ بۆ یەکەمین جار لە چیاکاندا ماڵ و خانەی دروستکرد، پاشان لە درەختەکاندا و لەدوایشدا لەو خانە و شوێنانەدا کە مرۆڤ بۆی دەسازێنێت و دروست دەکات.

# مـــاســـی

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى سَخَّرَ ٱلْبَحْرَ لِتَأْكُلُوا۟ مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُوا۟ مِنْهُ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى ٱلْفُلْكَ مَوَاخِرَ فِيهِ﴾النحل/١٤، واتە: هەر ئەو زاتەیە کە دەریای بۆ بارهێناوین تا گۆشتی تەڕو تازەی لێ بەدەستبێنن، تا لەناویدا جۆرەها گەوهەر و مرواری دەربێنن و لە دەست و ملی بکەن، دەبینیت کەشتییەکان دەریا لەت دەکەن.

یەکێك لەو زیندەوەرانەی لە دەریا و ئاوەکاندا دەژی، ماسییە.

گۆشـتی ماسـی دەوڵەمەنـدە بـە مـاددە پرۆتینییـەکان و فۆسـفۆر بەرێژەیەکی بەرز، فۆسـفۆر بـۆ خانـە زینـدووەکان و چالاکییان پێویستە.

ماسی زۆر کانزای گرنگی تری تێدایە وەك کالیسیۆم و یۆد.

ماسی لـە قـوڵایی ئـاو و لـەنێو دەریاکانـدا دەژی و خواردنیشـی لەسـەر ڕووەکە نقوم بووەکانی نێو قوڵایی ئاوە کە ماددەی (بلانۆنا)ی تێدایە و لـە ماسولکەکانیدا خەزنی دەکات، خۆی پێی کاریگەر نابێت، بـەڵام بـۆ مرۆڤـی دەگوێزێتـەوە کـە زۆر خێـرا پێـی کاریگـەر دەبێـت. کاریگـەربوونیش بـەم ماددەی (بلانۆنا)یە پاش خواردنی ژەمێکی ماسی دەردەکەوێت لـە وشـکی گەروو و زمان و لێدانی هێمنانەی دڵ و ئارامییەکی تـەواوی هـەموو جەسـتە لەگەڵ ئارەزووی خەو و خەوەنۆچکەدا.

لەبەرئەوەی ماسی پرۆتینی ئاژەڵی و ماددەی (بلانۆنا)ی تێدایـە، بۆیـە بـۆ ڕیخۆڵەئەسـتورە زۆر بەسـوودە و دڵـەڕاوکێ و هاتنەوەیـەکی ڕیخۆڵـە و

هەژان و ترشێتی گەدە کەمدەکاتەوە. (بلادۆنا)ش بۆ نەخۆشی قورحەی گەدە و دوانزەگرێ بەسوودە. (یۆد)یش لە چالاککردنی رژێنی دەرەقیدا رۆڵی کاریگەری هەیە، چونکە (یۆد) دەچێتە پێکهاتەی هۆرمۆنی (ثیرۆکسین)ەوە، بۆیە لەو ناوچانەی دوورن لە دەریا و سەرچاوەی کانزای (یۆد)یان نییە، رژێنی دەرەقی گەورە دەبێت و کەسەکە توشی ئەو نەخۆشییە دەبێت کە پێیدەوترێت درمی (لاجوتیر الجحوظی)... ئەم گەورەبوونەش لەسەر شێوەی لووی گەورە (ورم کبیر) لەپێشەوە لەسەر گەردن دەردەکەوێت، (یۆد) چارەسەری ئەم حاڵەتە دەکات و دەیگەڕێنێتەوە بارەکەی پێشووی. هەروەها هۆرمۆنی (ثیرۆکسین) بەرپرسە لەکرداری باڵغبوون لە نێرینەدا.

سەد گرام لە ماسی ئەم ماددانەی تێدایە: ١٦گرام پرۆتین و ٩گرام چەورییەکان و ٢٠ گرام لە کالیسیۆم و دوو گرام لە ئاسن و نیو گرام پۆتاسیۆم و فۆسفۆر و بڕێك ڤیتامین (B).

# ئەو ئاژەڵ و مێروانەی لەقورئاندا ناویان هاتووە

لە چەند جێگایەکی جیاوازی قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بە ئاژەڵ و مێرووەکان دراوە، جا یان بۆ حەرامکردنە (وەك بەراز) یان باسکردنی وەسفێکی خراپی هەندێك مرۆڤە (وەك گوێدرێژ و وشتر و مێشوولە و مێش و جاڵجاڵۆکە) یاخود پیرۆزی پێدان (وەك ئەسپ).

چەند سورەتێکی قورئان بەناوی هەندێك لە ئاژەڵ و مێرووەوە ناونراون، ئەوانیش: البقرة– النحل– النمل– العنکبوت– الفیل– الأنعام.

لە قورئاندا ئاماژە بە ئاژەڵان دراوە بەشێوەیەکی گشتی، وەك (الدَّابَّة) ١٤ جار، (الدّواب) ٤ جار (جا مەبەست لێی بەدیهێنراوەکانە (بە مرۆڤیشەوە)، چونکە بەسەر زەویدا دەڕوات، یاخود هەر تەنها ئاژەڵان دەگرێتەوە یان ئەو مێروانەی بە کرۆژەری درەختەکان ناسراون. هەروەها جانەوەرانی کۆتایی دونیا کە وەك نیشانەیەکی ڕۆژی دوایی دەردەکەون).. (طیر) لە قورئاندا ٣٤ جار هاتووە و (طائر)یش ٥ جار. (لەوانە باڵندەی ئەبابیل و باڵندەی ئیبراهیم و عیسا و ئەو فریشتانەی دەفڕن)... وە (الجوارح) یەك جار هاتووە (جا لەئاژەڵان بێت وەك سەگەکان یاخود پەلەوەر و باڵندە بێت وەك باز)... هەروەها (السبُع) هاتووە وەك ئاماژە بۆ ئاژەڵانی وەك شێر و پڵنگ و گورگ و تانجی و کەمتیار و هاوشێوەی

ئەوانە... (الأنعام)یش کە (وشتر و مانگا و مەڕ و بزن دەگرێتـەوە) ٣٢ جـار هاتووە و هەر لە سورەتی (الأنعام) دا چوار جار دووبارەبووەتەوە.

لە سورەتی (الأعراف) دا زۆرترین ژمارەی ناوی ئاژەڵ و مێروو هـاتووە، باسـی ١٠ جـۆر کـراوە: وشـتر و مانگـا و مـار و کوللـە و ماسـی و باڵنـدەی شـەلاقە و بـۆق و ئەسـپێ و مـەیمون وسـەگ... هـەر لـە قورئـانی پـیرۆزدا هەندێك لە بەروبومە ئاژەڵیە گرنگەکان بۆ خـۆراکی مرۆیـی هـاتووە: وەك (البیض المکنون) هێلکەی کڕ لەسەر کەوتوو و (العسل) هەنگوین و (اللـبن) شیر و (الأوبار) تووك و موو و (الجلود) پێست و (الصوف) خوری و (اللحوم) گۆشت و (الشحوم) چەوری.

ئەم خشتەیە ڕیزبەندیی ئەو ئاژەڵ و مێروانەیـە کـە لـە قورئانـدا ناویـان هاتووە (بەپێی پیتە هیجائییەکان) لەگەڵ نـاوی ئـەو سـورەت و ئایەتانـەی تیایاندا هاتوون.

| ناوی ئاژەڵە ناوهاتووەکان لەقورئاندا | ناوی سورەت و ژمارەی ئایەتەکان کە ناوەکانی تێدا هاتووە |
| --- | --- |
| الإبل – الناقة –(البحيرة)– (السائبة)–(الوصيلة)–(الحامي) – الجمل – (الحام) | الأنعام(١٤٤) الغاشية(١٧) هود(٦٤) الأعراف (٧٧،٤٠،٧٣) الإسراء(٥٩) الشعراء(١٥٥) القمر(٢٧) الشمس(١٣) الحج (٢٧) المائدة(١٠٣) |
| البعوضة | البقرة(٢٦) |
| البغال | النحل(٨) |
| البقرة – البقر – العجل (ويشمل عجل إبراهيم السمين و عجل له خوار الذي اتخذه بني إسرائيل إلها) | هود(٦٩) البقرة(٦٧،٥١،٦٨,٦٩،٥٤،٩٢،٩٣،٧١،٧٠) الأنعام(١٤٦،١٤٤) النساء(١٥٣) الأعراف(١٥٢،١٤٨) طه(٨٨) الذاريات(٢٦) |
| الثعبان– الحية | الأعراف(١٠٧) الشعراء(٣٢) طه(٢٠) |
| الجراد | الأعراف(١٣٣) القمر(٧) |
| الحمار– الحمير– حمر | الجمعة(٥) النحل(٨) لقمان(١٩) المدثر(٥٠) |
| الحوت – الحيتان – اللحم الطري (السمك) –صيد البحر وطعامه | الكهف(٦٣،٦١) الصافات(١٤٢) القلم(٤٨) الأعراف(١٦٣) فاطر(٢١) المائدة(٩٦) |
| الخنزير | البقرة(١٧٣) المائدة(٣) الأنعام(١٤٥) النحل(١١٥) |
| الخيل | آل عمران(١٤) الأنفال(٦٠) ص(٣١) العاديات(١) |
| الذئب | يوسف(١٧،١٤،١٣) |
| الذباب | الحج(٧٣) |
| السلوى | البقرة(٥٧) الأعراف(١٦٠) طه(٨٠) |
| الضأن– النعجة – ذبح عظيم(الكبش) | الأنعام(١٤٣) ص(٢٤،٢٣) الصافات (١٠٧) |
| الضفادع | الأعراف(١٣٣) |

| ناوی ئاژەڵە ناوهاتووەکان لەقورئاندا | ناوی سورەت و ژمارەی ئایەتەکان کە ناوەکانی تێدا هاتووە |
|---|---|
| العنكبوت | العنكبوت(٤١) |
| الغرب – الغرابيب | المائدة(٣١) فاطر(٢٧) |
| الفراش | القارعة(٤) |
| الفيل | الفيل(١) |
| القردة | البقرة(٦٥) المائدة(٦٠) الأعراف(١٦٦) |
| القسورة(الأسد باللغة الحبشية) – السبع | المدثر(٥١) المائدة (٣) |
| القمل | الأعراف(١٣٣) |
| الكلب | الأعراف(١٧٦) الكهف(٢٢،١٨) |
| المعز | الأنعام(١٤٣) |
| النحل | النحل(٦٨) |
| النمل | النمل(١٨) |
| الهدهد | النمل(٢٠) |

لە خشتەکەوە دەردەکەوێت کە قورئانی پیرۆز ٢٧ پۆلی ئاژەڵانی باسکردووە. شیردەرەکان زیاتر لەوانی تر هاتوون (١٢ جۆریان): چواریان لە ئاژەڵە کاوێژکارەکان و سیانی گۆشتخۆر (شێر– سەگ– گورگ) و چوار لەوانەی بۆ سواری بەکاردێن (ئەسپ– هێستر– گوێدرێژ– فیل) و (بەراز و مەیمون)... لەگەڵ هەشت جۆر مێروو و سێ جۆر باڵندە و یەك جۆر لە هەریەکە لە ماسی و خشۆك و وشکاوەکییەکان.

لەم بەشەدا بەکورتی چەند زانیارییەکی سەرەتایی لەسەر هەریەکە لەو ئاژەڵانە دەدەین، بەهیوایین ئەمە سەرەتایەك بێت بۆ خوێنەر کە خۆی بەدوای زانیاری زیاتر لەبارەی ئەم ئاژەڵانەوە بگەڕێت.

## (١) وشتر (الإبل – Camel)

خـــــوای گـــــەورە دەفـــــەرموێت: ﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلۡإِبِلِ كَيۡفَ خُلِقَتۡ﴾الغاشـية/١٧. واتـە: ئایـا ئێـوە سـەرنجی وشـتر نـادەن چـۆن دروستکراوە.

لەبەر ئەو کۆمەڵە خەسڵەت و تایبەتمەندییە سەیر و سەرسامکارانەی لە پێکهاتەی لەشی وشتردایە، خوای گەورە هانی مرۆڤ دەدات لێی بڕوانێت و بە وردی تەماشای تایبەتمەندییەکانی بکات.

وشتر برژانگی درێژی ئەستوری هەیە لە باشبینی لە شەو و ڕۆژیشدا یارمەتی دەدات. لە لوتی وشتردا ئەو هەوا گەرمەی هەڵیدەمژێت شێدار دەبێت و لە هەناسەدانەوەشدا ساردی دەکات تاکو هەڵمی ئاوەکە بۆ لەشی بگێڕێتەوە، لوتی وشتر ونکچووی ئامێری کۆندێشنە. پێستی وشتر بە بەراورد بە ئاژەڵانی تر ئەستوورترە، ئەمەش نەگەیەنەرێکی (عازل-



جیاکەرەوە)یەکی گەرمی دروستدەکات و کرداری هەڵمانـدن کەمدەکاتەوە. هەستی بۆنکردنی بەهێزە، دەتوانێت لەدووری پانزدە کیلۆمەترەوە بۆنی هاوڕێکانی بکات. لێوی سەرەوەی جۆرێکە خواردنی ڕووەکە دڕکاوییەکانی بۆ ئاسان دەبێت و ٣٤ ددانیشی هەیە.

هەندێکیان (لە جۆری عەرەبی) کۆپارێکیان لە چەوری لەسەر پشت هەیە و هەندێکیشیان

دوانیـان هەیــە، هــەرکات بیانــەوێت بــە ئاســانی دەتــوانن چــەورییە خەزنکراوەکـەی کۆپاریـان سـەرف بکـەن، بـەهۆی جوڵـە و فاکتـەری کێشکـردن. قـیتی و بـەرزی کۆپـار نیشـانەی تەندروسـتی باشـی وشـترە و کۆپاری بچوکیش نیشانەی نەخۆشییەتی.

وشتر لەسەر برسێتی و تینوێتی ئارام دەگرێت و لە دیواری گەدەیدا ئـاو و خـۆراك خـەزن دەکـات. ئـەو خەسـڵەتەی وا لـە وشـتر دەکـات بەرگـەی نارەحەتی رێگا و گەرما بگرێـت بـەبێ خـواردن و خواردنـەوە ئەوەیـە کە جەستەی بەشـێوەیەك خـولقێنراوە زۆر خـەزن بکـات و کـەمیش ون بکـات. توانایەکی گەورەی هەرسکردن و مژینی هەیـە و دەردراوەکانیشـی (ئـارەق، لیك، میز و پیسایی) کەمن... هەروەها زۆر لەو ژارەی بـۆ ژینگـە دێـت وەك (یۆریا) ئـەم ئاژەڵـە پارێزگـاری لێـدەکات، وشـتر هـاوڕێی ژینگەیـە. ئـەم خەسڵەتەی دوایان راڤـەی ئـەو رێنماییـەی پێغەمبـەر (ﷺ) دەکـات کـە لەدوای خواردنی ژەمێك گۆشتی وشتر دەستنوێژ بگیرێت.

خڕۆکە سورەکانی خوێنی هێلکەین، ئەم شێوەیە لە باڵندەکانیشدا هەیە تاکو وەها لە لەشیان بکات سوك و جوڵە ئاسان بـن، هـەروەها ئـەم شـێوە هێلکەییە درێژکۆلەییە هەندێجار ڕۆیشتن و دەرچوونی خوێنیش لەناو بۆری و مولوولـەکانی خوێنـدا ئاسـان دەکـات، ڕۆیـنی خـوێن ئاسـان دەکـات و ئەگەری وەستانیشی زۆر کەم دەکاتەوە. وشتر دەتوانێت زیـاتر پارێزگـاری لە شلە ئەلیکترۆلیتییەکان (کانزا و خوێیـەکان) بکـات لـە لەشـیدا، بـەوەش چالاکی و زیندوویەتی لەو کەشە سەختەی بیاباندا زیاتر دەبێت.

وشـتر دەتوانێـت ٢٠٠ لـیتر ئـاو لـەماوەی ٢٤ کاتـژمێردا بخواتــەوە. دەتوانێت بەتەنیا بەخێرایی ٢٠کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا بـۆ مـاوەی ٣ڕۆژ و بە کەسێکیشەوە کە لەسەر پشتی بێت ١٢ کاتژمێر بە بەردەوامی بەبێ ئـاو

و خۆراك بەرێدا بڕوات. دەتوانێت ٤٠٪ ی شێی لەشی ونبکات بێئەوەی کاریگەری خراپی لەسەر دروستبێت، لەکاتێکدا ئەگەر زیندەوەرانی تر ١٢٪ ی شێی لەشیان لەدەستبدەن دەمرن و تیادەچن.

پێستی وشتر بۆ پێڵاو بەکاردێت و توکەکەی بۆ پۆشاك و شیر و گۆشتەکەشی بۆ خواردن. شیری وشتر تاکە شیری ئاژەڵانە کە ڤیتامین (C) ی تێدایە، ئەم ڤیتامینە پارێزگاری لە شیرەکەی دەکات بۆ ماوەیەکی درێژ بەبێ خراپبوون بمێنێتەوە. شیری وشتر بۆ چارەسەر بەکاردێت، ئەمەش ڕاستێتی زانستی بوونی ئەو ئامۆژگارییەی پێغەمبەر (ﷺ) ڕوونتر دەردەخات کە ڕێنمایی دەدات بۆ بەکارهێنانی شیری وشتر (تەنانەت میزەکەشی!) بۆ چارەسەرکردن.

ئاژەڵێکی پێکهاتە سەیر و بەهێز، کەچی بۆ مرۆڤ ڕامکراوە.

## (٢) مێشووله (البعوضة- Mosquito)

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْيِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ۘ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِى بِهِۦ كَثِيرًا ۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ﴾ البقرة/٢٦. واتە: بەڕاستی خوا شەرم ناکات هەر نموونەیەك بهێنێتەوە (بە بچوکترین دروستکراوی) مێشوولەیەك یا لەویش بچوکتر. جا ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، چاك دەزانن کە ئەم نموونەیە ڕاستە و لەلایەن پەروەردگاریانەوەیە، بەڵام ئەوانەی کە کافر و بێ بڕوان دەڵێن: خوا مەبەستی چییە لەم نموونەیەدا؟ زۆرێکی پێ گومڕادەکات و زۆرێکی تریشی پێ هیدایەت و ڕێنموونی دەکات بەڵام دیارە کە جگە لە لار و وێر و یاخی و تاوانباران کەسی تری پێ گومڕا نابێت.



بۆچی خوای گەورە لە هێنانەوەی مێشووله بە نموونە شەرم ناکات؟ چونکە هەق و ڕاستییە و زانتی خودا کۆمەڵێك سیفەتی سەیری پێداوە.

مێشووله لە مێرووە دووباڵییەکانە و لەگەڵ مێشدا

لە هەمان خێزانن، مێشوولە لە هەموو جیهاندا هەن جگە لە جەمسەرەکان و لە بەرزایی ٥٥٠٠مەتر و نزمایی ١٢٥٠مەتر لە ئاستی ڕووی دەریاوە.

مێشوولە ٢٤ ڕەگەز یان جۆری هەیە و ٣١٠٠ پۆل دەگرێتەوە. لەماوەی ژیانیدا نزیکەی هەزار گەرا (لەهەر جارێکدا ١٧٠ گەرا) لە ئاوی وەستاو (مەنگدا) دادەنێت... مێیەی مێشوولە کە گەراکانی پێیە بەهۆی وەرگری هەستیار کە لەژێر سکیدا هەن لە جێگایەکی گونجاو دەگەڕێت بۆ دانانی گەراکانی، کە جێگایەکی نزیییەوە دایاندەنێت. درێژی هەر گەرایەك لە ١ملی مەتر تێپەڕناکات. لەدوای دانانی گەراکان کە ڕەنگیان سپییە و لەدوای تێپەڕبوونی ١–٢ کاتژمێر لەکرداری دانانەکە، ڕەنگەکەی بۆ ڕەش دەگۆڕێت (مەبەست لە ڕەنگ گۆڕینەکەش پارێزگاری و شاردنەوەیانە لە مێروو و باڵندەکان، تا نەبنە خۆراکی ئەو زیندەوەرانە)، هەندێکیان بەپێی ژینگەکەیان ڕەنگیان دەگۆڕن.






پاش ٣–٨ ڕۆژ گەراکان دەترووکێن و کرمۆکەکان دەردەچن و لەپاش تێپەڕبوونی ٩–١٤ ڕۆژ مێشوولەیەکی کامڵی لێ پێکدێت و بەهەوادا دەفڕێت.

لەدوای ئەوەی مێشوولە لەسەر لەشی کەسێك (خانەخوێ) دادەبەزێت، بە دەردانی سڕکەرێکی جێگایی (موضعي) ڕووی پێستەکە شێدار دەکات بۆئەوەی بە ئاسانی خورتومەکەی بەناو پێستەکەدا (وەك دەرزی)یەك بیات. ئەم خورتومە شەش بەشی لاوەکی تری هەیە

(وەك چەقۆ وەهان) خورتومەکە لەسەر ڕووی پێستەکە جێگیر دەکەن تاکو بە ئاسانی بچێتە نێو نزیکترین خوێنبەری ڕووکارییەوە، ئەم مێرووە توانایەکی باشی هەیە لە جیاکردنەوە و هەستکردن بە خوێنبەرەکان، مێشوولەکە پێستەکە کونددەکات و پاشان خوێن دەمژێت... نهێنی گواستنەوەی نەخۆشی بەهۆی مێشوولەوە لە کرداری هێلنجدانیایەتی کە لە هەموو مژینێکی خوێندا دەیکات، ئەوەی مژیویەتی لە لەشێکەوە دەیبات بۆ لەشی کەسێکی تر تا لەکۆتاییدا ژەمەخواردنێکی نوێ بەدەستدێنێت.

مێشووله لە ڕژێن (لیك)ـەکانیدا ماددەیەکی دژەمەیین هەیە وەك (EDTA) وایە، وەها لە خوێنە مژراوەکە دەکات بە بەردەوامی هەر بە شلی بمێنێتەوە و ئاسانیش بچێتە لەشیەوە و دووبارە لەسەر لەشێکی تر بیهێنێتەوە.

کاتێك مێشووله ئامانجێك دەدۆزێتەوە جێگایەکی دیاریکراو بەهۆی خورتومەکەیەوە دیاریدەکات... مێشووله دەرزییەکی بە دلپۆشەرێکی تایبەت داپۆشراوی هەیە، هەرکات خوێنی مژی دەریدەکاتەوە. پێست بەهۆی ئەم دەرزییەوە کون نابێت، بەڵکو بەهۆی لێوی سەرەوەیەوە دەبێت کە وەك چەقۆ وەهایە و لێوی خوارەوەشی ددانی لاری ڕووەو ناوەوەی پێوەیە.

لێوی خوارەوە کاری (مشار) دەکات واتە وەك مشار دەجوڵێت و بەهۆی لێوی سەرەوە پێستەکە شەق دەکات، هەر لەجێگای شەقبوونەکەوە دەرزییەکە دەچێتە ژوورەوە تادەگاتە خوێنبەر و کرداری مژینەکە دەست پێدەکات. لەماوەیەکی کورتدا ئەنزیمەکانی لەشی کەسەکە کە خوێنی دەمژرێت هەڵدەستێت بە مەیاندنی خوێن لەو جێگایەدا، بەڵام مێشوولەکە ماددەیەك لە لەشیدا دروستدەکات و بۆ خوێنهێنەری مرۆڤی دەردەکات لەو

ناوچەیەدا، ئەوەش بۆ ڕێگەگرتن لە مەیاندنی خوێن، بەوجۆرەش کاری مژینەکە تەواو دەبێت.

ناسراوترین جۆری مێشوولە (ئەنۆفیلس)ـە کە ترسناکترین جۆریانە و میکرۆبی نەخۆشی مەلاریا دەگوێزێتەوە. مێشوولە ڕێژەی ٩٠٪ی ئەو نەخۆشییانە دەگوێزێتەوە کە بەهۆی مێرووەکانەوە توشی مرۆڤ دەبن.

نێرەی مێشوولە خۆراکی لەسەر مژینی ڕووەک و گوڵ و گوڵاوەکانیانە، بەمجۆرە تەنها مێیەکان خوێنی ئاژەڵ و مرۆڤەکان دەمژن. وەك لە ئایەتەکەدا مێشوولە (بعوضة) بە مێ هاتووە... نهێنی تایبەتمەندێتیشی لە مژینی خوێن گەڕانیەتی بەدوای سەرچاوەی پرۆتیندا بۆ بەرهەمهێنان و پێگەیاندنی گەراکانی، ئەو جەخت دەکاتەوە لەسەر مژینی خوێن تا پارێزگاری لە وەچەی خۆی بکات.

مێشوولە ئامێرێکی زۆر هەستیاری هەستکردن بەگەرمی هەیە (ئەندازەی هەستیارییەکەی ١\١٠٠٠ پلەیە). بەکارهێنانی تیشکی ژێر سوور لەو شەبەنگەدایە کە مێشوولە دەتوانێت ببینێت و بەهۆیەوە لە توانایدایە هەست بە کەمی خەوتوو و بێداربکات، جیاوازی بکات لەنێوان دایك و باوك و منداڵ و تەنانەت ئافرەتی سکپڕ و ئافرەتی تردا.

مێشوولە ١٠٠ چاوی کۆکراوەی هەیە لە دوو چاوی ئاوێتەدا کە بە سەریەوەیەتی بەشێوەی شانەی هەنگوین. چاوەکانی مێشوولە ئاماژەکان وەردەگرن و بۆ دەماخی دەگوێزنەوە.

ئەم مێرووە ٤٧ددان لە دەمیدا هەیە و وەك هەر مێروویەکی تر دوو شاخی هەستیاری هەیە و سکی لە ٧ بەش پێکدێت و سوڕێکی سادەی خوێنی هەیە. شەش قاچی هەیە لەگەڵ دوو باڵی لاواز و تەنك لەپشت دوو باڵە گەورەکەیەوە.

بنــەمای کۆئەنــدامی هەناســـەدانی کرمۆکـــەی مێشـــووله (Lervae) لولەیەکی ناوبۆشە کە بـەرەو دەرەوەی ئاوەکـە دەریـدەکات تـا بەهۆیـەوە هەناسە بدات. کرمۆکەکە بە هەڵگەڕاوەیی لەئاوەکەدا خۆی نقـوم کـردووە، بـۆ ڕێگـرتن لـە چـوونە ژوورەوەی ئـاو بـۆ نێـو ئـەو لولەیـە مێشـوولەکە ماددەیـەکی کـەتیرەیی دەردەکـات... ئـەم مێـرووە لـەڕێی ئـەو لولەیـەوە هەناسە دەدات و هیچ ئاوێکیشی تێ ناچێت.

## (٣) هێستر (البغال- Mules)

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَالْخَيْلَ وَالْبِغَالَ وَالْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾ النحل/٨، واتـە: ئەسـپ و مـایین و هێسـتر و گوێدرێـژی (بـۆ بـەدیهێناون تـا بـۆ) سـواری و گواسـتنەوە بـەکاریبهێنن. (سەرەڕای) دیمەنی قەشەنگیان. و شتی تریش دروستدەكات (كە ئێستا ئێوە) نایانزانن.



هێسـتر بوونەوەرێكە لـە جووتبوونی گوێدرێـژ و ئەسـپەوە دروسـتدەبێت. لـەبارەی ئەسـپ وەردەگرێت و سیفەتی گوێدرێژی هەیە. بۆیە ئەوەی دروسـتدەبێت بـەهێزترە، ئـەوەی زیـاتریش بەهێزی دەكات نەزۆكییەكەیەتی. هۆكارەكەشی ئەوەیە كە ژمارەی تاكی كرۆمۆسۆمی هەیـە (٦٣ كرۆمۆسـۆم)، لـە نێوەنـدی كرۆمۆسـۆمەكانی گوێدرێژ (٦٢ كرۆمۆسۆم) و مێیەی ئەسپدایە كە ژمارەی كرۆمۆسـۆمەكانی (٦٤ كرۆمۆسۆم)ە.

## (٤) مانگا (البقرە- Cattle)

مانگـا لـە چـەند جێگایـەکی قورئـانی پـیرۆزدا ئامـاژەی پێـدراوە و سورەتێکیش بەناویەوە ناونراوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قَالُواْ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا فَارِضٌ وَلَا بِكْرٌ عَوَانٌۢ بَيْنَ ذَٰلِكَ فَٱفْعَلُواْ مَا تُؤْمَرُونَ ۝٦٨ قَالُواْ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ۝٦٩ قَالُواْ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ إِنَّ ٱلْبَقَرَ تَشَٰبَهَ عَلَيْنَا وَإِنَّآ إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهْتَدُونَ ۝٧٠ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا ذَلُولٌ تُثِيرُ ٱلْأَرْضَ وَلَا تَسْقِى ٱلْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لَّا شِيَةَ فِيهَا قَالُواْ ٱلْـَٰٔنَ جِئْتَ بِٱلْحَقِّ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُواْ يَفْعَلُونَ ﴾البقرة/ ٦٨-٧١. واتـە: وتیـان لـە پـەروەردگارت داوابکـە بۆمان ڕوونبکاتەوە ئەو مانگایە چۆنە؟ موسا وتـی: خـوا دەفـەرموێت: ئـەو مانگایـە نـە پـیرە و نـە پارتیـە بـەڵکو میانەسـاڵە (ئـیتر ئەوەنـدە قـووڵی مەکەنـەوە) چ فـەرمانێکتان پێدراوە جێبـەجێی بکـەن. کەچـی وتیـان: لـە پەروەردگارت داوا بکە بزانین ڕەنگی چۆنە؟ موسا وتی: خوا دەفـەرموێت: ئەو مانگایە ڕەنگی زەردی تۆخـە، تەماشـاکەرانی بەسـەیرکردنی دڵخۆش دەبن. کەچی هەر وتیان: لـە پـەروەردگارت داوا بکـە تـا بەتـەواوی بۆمـان ڕوونبکاتـەوە بـزانین ئـەم مانگایـە چـۆن مانگایەکـە؟! بەڕاسـتی ئـەم مانگایەمان بۆناڵۆزرێتەوە، ئەگەر خوا ویستی لەسـەر بێت دەیدۆزینـەوە و ڕێمان لێی دەکەوێت. موسـا وتـی: خـوا دەفـەرموێت: ئـەو مانگایـە مێشـتا

ڕانەهێنراوە، بۆ جووت کردن و زەوی کێڵان و ئاودێری کشتوکاڵی پێ نەکراوە، یەك ڕەنگە و پەڵە پەڵە نییە. ئەوسا وتیان ئا ئێستا ئیتر هەواڵی ڕاستەقینەت پێداین (ئیتر دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر بەدەستیان هێنا) و سەریان بڕی، هەرچەندە خەریك بوو ئەو کارە نەکەن.

چۆنیەتی هەڵبژاردنی باشترین مانگا و گرنگترین خەسڵەتەکانی، وەك لە ئایەتەکاندا ئاماژەی پێدراوە بەپێی ڕای زانایانی ڕاڤەکاری قورئان ئەوەیە کە: ١) تەمەنی مامناوەند بێت، زۆر تەمەن کەم نەبێت شیر بەرهەم نەهێنێت یاخود کەم بەرهەم بێت، پیریش نەبێت کە دیسانەوە بەرهەمی شیری کەم بدات. زانیارییەکی چەسپاوە کە مانگا دوای دووەم و سێیەم جاری زاینی، واتە تەمەنی ٤-٥ ساڵانی بەرهەمێکی زۆر دەدات و پاشان وردەوردە بەرهەمەکەی کەم دەبێتەوە.

٢) ڕەنگی زەردێکی تۆخ بێت، واتە زۆر مەیلە و سپی بێت. ڕەنگی سپیش دیسانەوە پەیوەندی بە بەرهەمهێنانەوە هەیە. ڕەنگی سپی گەرمی و ڕووناکی دەداتەوە (بەپێچەوانەی ڕەنگی ڕەشەوە کە هەڵیاندەمژێت و بەوەش بەرهەمی کەم دەبێتەوە بەتایبەت لە وەرزی هاویندا) ئەمە لەکاتێکدا کە بەرهەمی مانگای سپی لە هاویندا بەرهەمەکەی زۆرە بەهەمان تێکڕاییەکانی زستان.



٣) مانگاکە بەهێز بێت و شەکەت نەبووبێت و بۆ کێڵان بەکارنەیەت، چونکە هەموو ئەمانە لەسەر حسابی بەرهەمەکەی دەبێت، کەمی دەکاتەوە.

٤) هەروەها هیچ نەنگییەکی دیار لە لەشیدا نەبێت.

ئەو خەسڵەت و پێوەرانە لەلایەن زانایەك یان پسپۆڕ و پزیشکێکی ڤێتێرنەری یاخود ئەندازیاری بەروبوومی ئاژەڵییەوە نەگوتراون، بەڵکو لە نیگادا لەلایەن زانای هەموو شت و خوای جیهانیانەوە هاتووە.

مانگا لە هەموو جیهاندا هەیە جگە لە ناوچە ساردەکان. لە لەوەڕگا و مێرگەکاندا بەخێودەکرێت لەپێناو گۆشت و شیر و پێستەکەیدا. هەروەها بەکاردەهێنرێت بۆ کێڵان و ڕاکێشان و هەندێجاریش هەڵگرتنی ڤورساییەکان. شاخێکی مامناوەندیی هەیە. ماوەی سکپڕیی ٢٨٥ ڕۆژە و کێشی بێچووەکەی دوای زاینی نزیکەی ٣٠ کیلۆگرامە کە پێویستە ڕۆژانە ٨ لیتر لە شیری دایکەکەیی پێبدرێت.

لە ڕێنماییەکانی پێغەمبەرە (ﷺ) کە گۆشتی مانگا نەخۆشی پێوەیە و شیرەکەشی دەرمانە. گۆشتەکەی گرفتبوون دروستدەکات بەهۆی ریشاڵە ئاڵۆزەکانییەوە، بەڵام دەربارەی شیرەکەی لەم دواییانەدا دۆزرایەوە کە ترشەڵۆکی چەوری نائێری تێدایە لەجۆری ئۆمێگا-٣ (لە دیارترینیان (Prostaglandin)ـە کە بەرگریکردن (مناعة)ی لەشی ئەو کەسەی دەیخواتەوە، دژی نەخۆشییەکان زیاد دەکات.

گوێرەکە بێچووی مانگایە، مانگا لەدوای ٩ مانگ گوێرەکەیەکی دەبێت و ماوەی ٨ مانگ لەلایەن مانگا دایکەکەوە بەخێو دەکرێت و چاودێری دەکرێت، دەگونجێت لەو ماوەیەدا گوێرەکەکان گژوگیا بخۆن.

ناوی گوێرەکەش لە قورئاندا هاتووە: ﴿ فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ فَجَآءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ ﴾الذاريات/٢٦. واتە: ئیتر خۆی دزییەوە و چوو بەهاواری خێزانی، گوێرەکەیەکی قەڵەویان بوو (سەری بڕی و سووریان کردەوە و) هێنای.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِى ٱلْأَنْعَٰمِ لَعِبْرَةً نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِى بُطُونِهِۦ مِنۢ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَآئِغًا لِّلشَّٰرِبِينَ ﴾النحل/٦٦. واتە: بەڕاستی لە بوونی ماڵات (و زیندەوەرانی جۆراوجۆردا) پەند و ئامۆژگاری هەیە بۆتان و جێگای سەرنج و تێڕامانە، لەنێوان ئەو شتانەی لە سکیاندا هەیە، لەگژوگیای هەرسکراو و خوێندا، شیرێکی پاك و بێگەرد و خۆش و بەتام (پڕ لە هەموو ماددەیەکی خۆراکی) پێشکەش بەئێوە دەکەین تا بینۆشن.



# (٥) مار (الثعبان- الحية - Snake)

خوای گەورە لەبارەی مارە گەورەکەی موسا پێغەمبەرەوە (سەلامی خـــوای لێبێـــت) دەفـــەرموێت: ﴿ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴾ الأعراف/١٠٧. واتە: (موسا) گۆچانەکەی فڕێدا و دەستبەجێ بوو بە مارێکی ئاشکرا.

(ثعبان) مارێکی گەورە و درێژە و هەندێجار مەبەست لێی ماری نێرە. ئەمجۆرە لە زۆربەی خشۆکەکان زیاتر توانای ژیانی هەیە لە بوارگەلی فراوانی گەرمیدا. بە درێژکۆلەیی لەشی جیادەکرێتەوە کە هیچ پەلێکی نییە. بڕبڕەی پشتیشی جۆرێك جوڵەی هەیە دەتوانێت بازبدات، مار پێڵوی نییە بۆیە چاوی داناخات.

هەندێك لە مارەکان بەدەوری نێچیرەکەیاندا پێچ دەخۆن و پەستانی دەخەنە سەر و دەیکوژن و پاشان لوشی دەدەن. مار دەتوانێت ئاژەڵی گەورەتر لەسەری خۆی بخوات. هەیانە دەتوانێت ئاسکێك بکوژێت و بیخوات بەهۆی ئەوەوە کە دەتوانێت کۆی ئێسکی دەمی پێکەوە بجوڵێنێت، چونکە کاکیلەکانی پێکەوە نەبەسترلون.



خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿ فَأَلْقَىٰ مُوسَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴾ الشعراء/٤٥. (تلقف) واتە بەخێرایی و باشی نێچیرەکەی دەخوات. ئایەتەکە واتە: موسا گۆچانەکەی فڕێدا، هەرچی درۆ و

دەلەسە و گوریس و داریان هەبوو، هەر هەمووی هەڵلوشی و لەناوی دا.

ژار تاکە هۆکاری خۆپارێزی مار نییە، ماری گژوگیایی ئەورووپی بەدەردانی شلەیەکی بۆن ناخۆش پارێزگاری لەخۆی دەکات. ماری لوت چەماوەش خۆی وەك مردوو پیشان دەدات و بەپشتدا خۆی هەڵدەگێڕێتەوە. زۆرینەی مارەکان ژاریان هەیە وەك (ماری کۆبرا) کە لە هیند و چین هەیە و هەندێکیان درێژییان دەگاتە پێنج مەتر و زیاتریش.

لەبارەی جوڵەی مارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَأَلْقَىٰهَا فَإِذَا هِىَ حَيَّةٌ تَسْعَىٰ﴾ طـه/٢٠. واتە: هەر کە فڕێی دا، بوو بەمارێکی زیندوو، بەخێرایی دەجولایەوە.

لەڕاستیدا ماری درەختان دەجوڵێن و بەنێو درەختەکاندا بەخێراییەکی زۆر خۆدەخلیسکێنن و دەجوڵێن. ماری بیابانیش بەشێوەیەکی لولپێچی دەجوڵێن تا لەنێو لمی بیاباندا خۆ نوقم دەکەن (ئەم کارەش وەك هەڵاتن لە گەرمای بیابان ئەنجام دەدەن).

مارە دەریاییەکانیش (کە لە پۆلی ماسییەکان دادەنرێت) زۆربەیان بۆ هێلکەدانان بەرەو کەنارەکان ناچن، بەڵکو هەر لە لەشی خۆیاندا هێلکەکان دەترووکێنن و بێچووی زیندوو لەدایك دەبێت و دەشتوانێت مەلەبکات. ئەم مارانە بەتەواوی ئاوین و لوتیان زمانەی تایبەتی هەیە ڕێ لە چوونەژوورەوەی ئاو دەگرێت بۆ نێو لەشیان.

# (٦) کولله (الجراد– Grasshopper)

کولله له پۆلێکی مێرووەکانه. پێیەکانی دواوەی درێژن و یارمەتی دەدەن له بازدان و جێگیربوونیدا. هەندێجار سوپایەکی ژمارە زۆری کولله کۆدەبنەوە و بۆ دووریی زۆر کۆچ دەکەن، ئەگەر لەسەر کێڵگەیەك نیشتنەوە ئەوکاتە هەرچی دانەوێڵە و بەرهەمی کشتیاری ئەو کێڵگەیە خراپ و وێرانی دەکەن. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿خُشَّعًا أَبْصَٰرُهُمْ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ﴾ القمر/٧. واته: (خوانەناسان) چاویان شۆڕە و شەرمەزارن، لەناخی زەوییەوە دێنەدەرەوە، هەروەك لێشاوی کوللەی زۆر (ڕووکاری زەوی دادەپۆشن).

له وەرزی هێلکەدانانـدا کولله بەهۆی پاشـووی لەشیەوە چاڵ دروستدەکات و له قووڵایی ئەو چاڵانەدا هێلکەکان دادەنێت که ماددەیەکی زوو ڕەقبووی پێوەیە. لەماوەی دوو هەفتەدا هێلکەکان دەترووکێن و کرمۆکەی بچوکی کوللەی تێدا دەبێت که توانای بازدانیان هەیە.



کولله لەسەر گەڵای ڕووەك دەژی و گاز و قـولاپی تایبەتی هەیە بۆ قرتاندن و کرۆژتنی گەڵای درەختەکان، پاش ماوەیەك پێستەکەی دەگۆڕێت و دەبێتە کوللەیەکی کامڵ. کولله جۆرێك پەردەی هەیە پێیدەڵێن (Tympani)

کە وەك پەردەی گوێ وایە و بەرپرسی وەرگرتنی لەرەلەرە دەنگییەکانی دەنگی باڵەکانی هاورێ کوللەکانی کۆمەڵەکەیەتی. ئەو پەردەیەش لە بەشی خوارەوەی دوو باڵی پێشەوەیدایە. دوو باڵی کاملێشی لەپشت دوو باڵی پێشەوەی هەیە. دوو چاوی پێکهاتە سادەی لەگەڵ دوانی ئاوێتەدا هەیە. ئەوەی وادەکات کێشی کوللە سوك بێت بوونی کیسی هەوایی ناوەکییە لەنزیك ڕووی لەشیدا، ئەم کیسانە دەرچەی دەرەکییان هەیە بەنێو پێستیدا.



## (٧) گوێدرێژ (الحمار– Donkey)

خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿وَٱقۡصِدۡ فِي مَشۡيِكَ وَٱغۡضُضۡ مِن صَوۡتِكَۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلۡأَصۡوَٰتِ لَصَوۡتُ ٱلۡحَمِيرِ﴾ لقمـــان/١٩. واتـــە: (هەوڵبـــدە) لـــە ڕۆیشـــتندا مامناوەندییانە برۆ، بەرەو ئامانجێکی چاك هەنگاوبنێ، بە دەنگی هێواش و لەبار گفتوگۆ بکە و بدوێ، چونکە بەڕاستی ناخۆشترین دەنگەکان دەنگی گوێدرێژە.

ئەم گوتارە لەسەر زمـانی لوقمـانی حـەکیم هـاتووە کاتێـك ئامۆژگـاریی کوڕەکەی دەکات و داوای لێدەکات دەنگی نـەرم بکاتـەوە، چـونکە دەنگـی بەرز نـاخۆش و بێزارکـەرە و بـە ژاوەژاو دادەنرێـت و زانایـانیش بـە ژینگـە پیسکەری دادەنێن. گوێدرێژ بە دەنگـە ناخۆشـەکەی (زەڕیـنی) بەناوبانگـە کە ناخۆشترین و بێزارکەرترین دەنگە.

زانایان ئاشکرایان کرد هەر گوێدرێژێك دەنگێکی تایبـەتی خـۆی هەیـە و دەکرێت بەهۆیەوە لەوانی تر جیابکرێتـەوە. هۆکـاری ناخۆشـی دەنگـی لـە کەم جوڵان و غار نەدانیایەتی.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلۡعَٰدِيَٰتِ ضَبۡحٗا﴾العادیات/١. واتە: سـوێند بەو ئەسپانەی (کەبەرەو گۆڕەپانی جیهاد) بە گرمە و پڕمە غاردەدەن.

(ضبح) حیلاندنێکی سوکە و بێزارکەر نییە. ئەسپ بەهۆی غارغارێنیەوە بەدەستیهێناوە، چونکە لـەوەوە هـەموو چـەوری دەوری دەنگـە ژێیـەکانی تواونەتەوە و ئەو ژێیانەش توشی گەرمبوون و کشان دەبن لەڕێی وەرزشـی غارغارێنەوە، ئەوەش هەروەك کشانی ژێکانی ئامێرە میوزیکییە ژێدارەکانە تاکو دەنگێکی بەرز و جوانیان هەبێت.

گوێدرێـژ ئارامگرییـەكی گـەورە و زۆری هەیـە و بەئاسـانی بـە ڕێگـای بەردین و سەختی شاخەكاندا ڕێ دەكات، هەروەها دەتوانێت بۆ ماوەیەك بەبێ ئاو بژی و دەشتوانێت ئاوی سوێر بخواتەوە. گوێدرێژ لە دوژمنـەكانی ڕادەكات و خۆدەشارێتەوە بەڵام ئەگەر هێرشی كرایە سـەر گـاز دەگرێـت و جوتەپێی دواوەشی بۆ بەرگری لەخۆكردن بەكاردێنێت.

گوێدرێـژی كێـوی لـە ئـەفریقا هـەن و بـە پێسـتە هێڵكارییـەكانیان لـە گوێدرێـژی ئاسـایی جیادەكرێنـەوە. (لـە باسـی گوێدرێـژی كێویـدا كورتـە باسێكی ئەمجۆرەیانمان كردووە).



## (٨) نەهەنگ (الحوت- whale) و ماسی (السمك- Fish)

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَمَا يَسْتَوِي الْبَحْرَانِ هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَائِغٌ شَرَابُهُ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى الْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ لِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ فاطر/١٢. واتە: هەردوو جۆر دەریا وەك یەك نین، یەکێکیان ئاوی سازگار و خۆش، ئـەوی تریـان سـوێر و تـاڵ، لـە هـەردووکیان گۆشـتی تـەڕ و تـازە دەخۆن، جۆرەها شتی گرانبەها دەردێنن و لەبـەری دەکـەن و خۆتـانی پـێ دەڕازێننەوە. ئینجا کەشتییەکان دەبینن ئاوەکە لەت دەکـەن و (بەئاسـانی پیایـدا دەڕۆن) تـا لـە بەخششـەکانی پـەروەردگار بـەهرەوەر بـبن، بـەڵکو سوپاسگوزاریش بن.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «دوو مردووتان بۆ حـەڵاڵ کراوە نەهـەنگ (ماسی) و کوللە» سنن إبن ماجه.

نەهەنگ و ماسی تەنها بە دەرهێنانیان لە دەریـا و ئـاو دەمـرن، یـاخود هـەر بـەهۆی پێداکـەوتنی تەوژمـە گـەرم و سـاردەکانەوە دەمـرن و سـەردەکەونە سـەر ڕووی دەریا خوێدارەکان، ئەمـەش حەڵاڵە و هیچ مەترسییەك لە خواردنیدا نییە.



درێـــژی نەهـــەنگێکی پێگەیشـتوو دەگاتـە نزیکـی

٥ ١مەتر و کێشەکەی ١٥٠تەن. ئەو هەستانەی لای نەهەنگ بەهێزن بیستن و بینین و هەستکردنن. نەهەنگ لەنێو شیردەرەکاندا خاوەنی گەورەترین مۆخە. نەهەنگی شین گەورەترین و قورسترین شیردەرە. زۆربەی نەهەنگەکان بە کۆمەڵ دەژین و دەتوانن تاقولایی ٢ کیلۆمەتر بچنە ژێر ئاوەوە، جارجارە بۆ هەناسەدان دێنە سەر ڕووی ئاو و لەڕێی دەرچەیەکەوە لەسەرەوەی کاسەی سەری هەوا بەکارهاتووەکەی نێو سییەکانی دەکاتە دەرەوە. نەهەنگ دەتوانێت ماوەی ١٥خولەك لەژێر ئاودا بمێنێتەوە، نەهەنگە گەورەکانیش سێ ئەوەندەی ئەوکاتە دەتوانن بمێننەوە.

گۆشتی نەهەنگ سوودگەلی گەورەی هەیە، بڕێکی زۆر لە پرۆتینەکانی تێدایە کە بەهایەکی خۆراکی گەورەیان هەیە، هەروەها دەوڵەمەندە بە ترشە ئەمینییەکان و ڕێژەیەکی بەرز لە فۆسفۆر کە بۆ پێکهاتەی شانەکان و ئێسکی منداڵ گرنگە. جگە لەوانەش کالیسیۆم و ڤیتامین (A) تێدایە کە بۆ سەلامەتی بینایی و پێست بایەخی گەورەیان هەیە.

لە گرنگترین سوودە پزیشکییەکانی زەیتی نەهەنگ: ڕێژەی کۆلیسترۆڵ دادەبەزێنێت و پەستانی خوێن کەمدەکاتەوە و ڕێ لە هەوکردنەکانی پێست و جومگەکان دەگرێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ ٱلْبَحْرِ وَطَعَامُهُۥ مَتَـٰعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ ۖ وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ ٱلْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا ۗ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ المائدة/٩٦. واتە: خواردنی زیندەوەرانی دەریایی حەڵاڵە بۆتان، هەر خواردنێکیش لەوان وەرگیرێت، هەروەها بۆ ئەوکەسانەش کە لەسەفەردان و ڕاوی زیندەوەرانی دەشتیی و کێوی لێتان حەرامە هەتا لە ئیحرامدا بن، لەو خوایە بترسن کە دەگەڕێنەوە بۆلای و بۆ لێپرسینەوە کۆتان دەکاتەوە.

(صَيْدُ الْبَحْرِ) لە ئایەتەکەدا مەبەست هەموو ئەوەیە کە ڕاودەکرێت لە نەهەنگ و ماسی و... بەڵام (وطعامُهُ) ڕاڤەکارانی قورئان دەڵێن ئەوەی بە مردوویی لە دەریاوە بەدەستدێت، ئێستا ماسی دەگرێتەوە.

ماسی دەکرێت بە دوو جۆرەوە: جۆرێکیان ئێسکییە و بەیەکەری ناوەوەیان ئێسکی ڕاستەقینەی هەیە و دووەمیش کرکراگەییە... ماسییەکان خوێیان پۆلیکن و جیاوازن لە نەهەنگە شیردەرەکان بەوەی گەرا دادەنێن. بەهۆی کەوانەی ڕیشودارەوە هەناسە دەدەن نەك بەهۆی سییەوە و تەنها لەناو ئاویشدا هەناسە دەدەن. ماسی بەهۆی جوڵەی کلکییەوە بۆ پێشەوە پاڵی پێوە دەنرێت و پەرەکەکانیشی ئاراستەی جوڵەی ڕێکدەخەن. هەندێ ماسی لە ئاوی شیرین و هەندێکی تر لە ئاوی سوێردا دەژین. زۆربەی ماسییەکان بە پوولەکە داپۆشراون.

لە قووڵایی کیلۆمەترێك یان زیاتری دەریادا ماسی شێوە سەیر دەژین، ڕەنگیان زیاتر سوور و ڕەشە. لە تەنیشتەکانی هەندێکیاندا پەڵەی تایبەتی هەن کە ڕووناکی مەیلەو سپی دەردەکەن.



## (٩) بەراز (الخنزير– pig)

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ اللَّهِ مَن لَّعَنَهُ اللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ الْقِرَدَةَ وَالْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ الطَّاغُوتَ أُولَٰئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ عَن سَوَاءِ السَّبِيلِ﴾المائدة/٦٠. واتە: (پێیان) بڵێ: ئایا هەواڵی لەوە خراپترتان بدەمێ کە کێ زەرەرمەندە و پاداشتی سامناکی بۆخۆی مسۆگەرکردووە؟! (لەڕاستیدا هەر ئەوجۆرە کەسانەن کە) خوا نەفرینی لێکردوون و ڕقی لێهەڵگرتوون، (هەندێک جاریش) کردوونی بە مەیمون و بەراز و بە بەندەی هەموو شتێکی ناشایستە. ئا ئەوانە جێگا و ڕێگایان زۆر ناساز و ناخۆشە، زۆر گومڕا و لادەرن لە ڕاستەڕێ و لە ڕێبازی دروست.

لەبارەی حەرامکردنی گۆشتی بەرازیشەوە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾النحل/١١٥. واتە: بەڕاستی تەنها گۆشتی مردارەوەبوو، خوێن، گۆشتی بەراز، ئەو سەربڕاوانەی کە بەناوی جگە لە خواوە سەردەبڕێن، لێی حەرامکردوون، بەڵام ئەوەی ناچاربوو (برسێتی زۆری بۆ هێنابوو، دەکرێت لەو گۆشت و شتە حەرامانەش بخوات بەمەرجێك) زیادەڕەوی تیانەکات و فێری نەبێت، (تەنها ئەوەندە بخوات کە لە مردن ڕزگاری ببێت) بێگومان (لە بار و دۆخی ئاوادا) خوا لێخۆشبوو و میهرەبانە.

لە هۆکارە دیارەکانی حەرامکردنی گۆشتی بەراز ئەوەیە کە گەورەترین کۆگای میکرۆب و مشەخۆری زیانبەخشە. بەشێوەیەك کە ٣٠ جۆر

نەخۆشـی بـۆ مـرۆڤ دەگوێزێتـەوە، مەترسـیدارترینیان کرمـی دەزولەییـە (الدودة الشعرية- Trichiella) و ٢٤ نەخۆشـی ڤایرۆسـی کـە دیارترینیـان ئەنفلۆنزای بەرازە و ١٥ نەخۆشی بەکتری کـە مەترسـیدارترینیان نەخۆشـی (الحمـرة- Erysipelothrix)یـە، ٢ نەخۆشـی (فطريـة) و ١٠ نەخۆشـی خۆراکی وەك قەڵەوی و بەرزبوونـەوەی کۆلیسـترۆڵ (هـەموو ٢ کیلۆگرامێك گۆشتی بەراز کیلۆیەك چەوری تێدایە واتـە بەرێـژەی ٥٠٪، بەرامبـەر بـەوە گۆشتی مەڕ ڕێژەی ١٧٪ و مانگا ٥٪ی چەوری تێدایە). ڕێژەی کۆلیسـترۆڵ لە چەوری بەرازدا بۆ مەڕ بۆ مانگا یەکسانە بە ٩: ٧: ٦.

هەروەها گۆشتی بەراز چەند نەخۆشییەکی دیکەش توشی مرۆڤ دەکات وەك ڕەقبوونی خوێنبەرەکان و پەستان و شێرپەنجە.

لە هۆکارەکانی تر ئەوەیە چەورییەکەی کە ناتوانرێت لـە گۆشـتەکەی جیابکرێتەوە ڕێژەیەکی زۆر کبریتی تێدایە، گۆشـتەکەی برینکی زۆر ترشی



(یۆلیك)ی تێدایە و هەموو ئەوانـــەش ئـــازاردەرن و هۆکاری شێرپەنجەن.

ســـەلمێنراوە ئەگـــەر چـــەوری بـــەراز بخورێـــت ئەوا لە چەوری نێو لەشی کەســـەکەدا هـــەمان پێکهاتەی چـەوری بەرازەکـە دروسـتدەبێت (هـەر بۆیـە ئەگـەر لـە حاڵـەتی برسێتییەکی زۆردا مرۆڤ ناچاری خواردنی بوو پێویستە تێری لێ نـەخوات و بە ٣ پاروو دەستهەڵگرێت).

ئـــەو کەســـەی گۆشـــتی بـــەراز دەخـــوات سروشـــت و ڕەفتارەکـــانی وەردەگرێت، وەك مەیل نەبوون لە مێیە و کۆمەڵێك خەسڵەتی بەدی تر.

لێکۆڵینەوەی زۆر هەن ڕەفتـاری مـرۆڤ پەیوەسـت دەکـەن بـە خـواردنی گۆشت و بەرهەمی ئەو ئاژەڵەی دەیخوات. بۆنموونە ئەو کەسـانەی گۆشـتی وشتر دەخۆن بە ئارامگری و بەرگەگرتن جیادەکرێنەوە، ئەوانەش کە زیـاتر گۆشتی مەڕ دەخۆن هێمن و لەسەرخۆن و... بەوجۆرە.

بەراز تەمبەڵە و حەزی بە ڕووناکی نییە، حەزدەکات بخوات و بخەوێت و زۆریش چڵێسە، چەند تەمەنیشـی زیادبکـات تەمبـەڵتر دەبێـت. هـیچ ورە و ئیرادەیەکی جەنگ و بەرگری لەخۆکردنێکی نییە. هـەموو شـتێك دەخـوات، تەنانـەت کـەڕوو و کـرم و مـاریش... ئـاژەڵێکی پیسـوچـەپەڵە و حـەزی بـە خۆوەردانە لە قوڕ و لیتە.

بـەراز لـە سـەرجەم کیشـوەرەکانی جیهانـدا هەیـە جگـە لـە کیشـوەری جەمسەری باشور. بەرازی کێوی بە ناشیرینترین شیردەرەکان دادەنرێت لـە دیمەنیـدا. ڕووخسـاری درێژکۆلەیـە و چـوار شـێوە کەڵبـە لـە دەمیـەوە دەرچوون، چاوەکانی بچوکن... ئەم بەرازانە خێراییان دەگاتە ٥٠کیلۆمـەتر لە هەر کاتژمێرێکدا، کاتێك دەڕوات کلکی بەرزدەکاتـەوە. مێیـەی بـەرازی کێوی لەهەر زانێکیدا ٢-١٢ بێچووی دەبێت، بەڵام بەرازی ماڵی ژمارەیەکی زیـاتری دەبێـت. مـاوەی سکپڕیشـی ٣,٥-٥ مانگـە و بێچووەکانیشـی تاڕادەیەك قەبارەیان گەورەیە.

## (١٠) ئەسپ (الخيل- Equine)

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ بِالْعَشِيِّ الصَّافِنَاتُ الْجِيَادُ ﴿٣١﴾ فَقَالَ إِنِّي أَحْبَبْتُ حُبَّ الْخَيْرِ عَن ذِكْرِ رَبِّي حَتَّىٰ تَوَارَتْ بِالْحِجَابِ ﴿٣٢﴾ رُدُّوهَا عَلَيَّ فَطَفِقَ مَسْحًا بِالسُّوقِ وَالْأَعْنَاقِ ﴾ ص/٣١-٣٣. واتە: دەمەو ئێوارەیەك ئـەو ئەسپە چـاكانەی (كـە ئامـادەكرابوون بـۆ غـەزا) هێنایـان و نمایشـیاندا، سولەیمان وتی: من هەمیشـە حـەز لـەمجۆرە كارانـە دەكـەم و گرنگـی بـەم ئەسپانە بـە خێـر دەزانم (لەگـەڵ ئەوەشـدا نابێـت ببنـەهۆی ئـەوەی) كـە لەیادی پەروەردگارم بێئاگام بكـەن و یـادی فـەرامۆش بكـەم، (ئەسـپەكان) غاریـان كـرد تـا لەچـاو ونبـوون. (لـەوەودوا سـولەیمان فـەرمانی دا) كـە بیانگێڕنەوە (و كە گەڕانەوە بۆلای) دەستی هێنا بە ڕان و ملیاندا.

ئەسپ ئاسان مەشقی پێدەكرێت و فێردەكرێـت، زاكیرەیـەكی بـەهێزی هەیە و بەوەفایشە بۆ خاوەنەكەی. ئەسپ مانگێكی تەواو لەسەر پێیـەكانی بـەبێ مانـدووبوون بـەپێوە دەوەسـتێت، هـەر بـەوجۆرەش دەخـەوێت. قاچەكانی ئەسپ درێژ و بەهێزن، یارمەتی دەدەن لە ڕاكێشـانی گالیسـكە و لێدانی هەر هێرشبەرێك بۆی. كونەلوتی فراوانـە و ئـەوەش یارمـەتی دەدات لە هەڵمژینی هەوای پێویست. دیارترین هەستە بـەهێزەكانی ئەسـپ بـریتین لە: بینین و بیستن و بۆنكردن.

ئەسپ دوو جۆری سـەرەكی هەیـە: ئەسـپی عـەرەبی خێـرا كـە ئەسـپی پێشبڕكێیەكانن و ئەو ئەسپەی كە لە دۆڵی دەریای (كلایدویشـار) هەیـە بـۆ ڕاكێشانی قورسـایی بـەكاردێت. ئەسـپی بچـوكیش هـەن بـەرزییان دەگاتـە

نزیکەی یەك مەتر و بیست سانتیمەتر و کێشیان ٢٢٥کیلۆگرام دەبێت.
نەژادی ئەمجۆرە ئەسپە دەگەڕێتەوە بۆ دوورگەی (شتلاند) لەباکوری (ئوسکتلەندە) و بە (فولابیلا) ناسراوە.



## (١١) گورگ (الذئب- wolf)

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ قَالَ إِنِّي لَيَحْزُنُنِيٓ أَن تَذْهَبُواْ بِهِۦ وَأَخَافُ أَن يَأْكُلَهُ ٱلذِّئْبُ وَأَنتُمْ عَنْهُ غَٰفِلُونَ ١٣ قَالُواْ لَئِنْ أَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّآ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ ﴾ یوسف/١٣-١٤. واتە: باوکیان وتی: من زۆر غەمناك دەبم کە ئێوە یوسف بەرن، دەترسم گورگ بیخوات و ئێوە گوێی نەدەنێ و لێی بێئاگابن... وتیان: گەر بێت و یوسف گورگ بیخوات، ئێمەش کۆمەڵێکی تاوا بەهێز لەگەڵیدا بین، بەڕاستی ئێمە زۆر خەسارەتمەندین.

مەبەستی ئایەتەکە گورگە بەشێوەیەکی گشتی (هەر ڕەگەزێك)...



ئایەتەکان باس لە ڕەفتاری دوژمنکارانەی کەڵبەدارەکان دەکەن. لەو ئایەتانەدا یەعقوب پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) لەبارەی یوسفەوە بە کوڕەکانی تری دەڵێت: "دەترسم گورگ بیخوات و ئێوە لێی بێئاگابن".

ڕەفتاری دوژمنکاریش لە دوو حاڵەت بەدەر نییە: باڵادەستی و سەرۆکبوون یاخود ترس لە بوونی هێزی تر. هەمیشە کەڵبەدارەکان دەبینین بەدوای ئەوانەدا ڕادەکەن کە ڕادەکەن، یاخود لەوە ڕادەکەن کە بەدوایانەوەن.

گورگ گەورەترین ئەندامی خێزانی کەڵبەدارەکان پێکدێنن کە سەگ و ڕێوی و چەقەڵ و پشیلە دەگرنەوە. گورگ لە وەرزی زستاندا دەزێت و ماوەی سکپڕیشی ٦٥ڕۆژە و لە هەرجارێکدا مێیە ١-١١ بێچووی دەبێت کە لەکاتی لەدایکبوونیاندا کوێرن و نابیستن.

گورگ هەستی بەهێزی هەیە، بینین و بۆن و بیستنی زۆر هەستیاری هەیە بەڕادەیەك کە دەتوانێت ئاسکێك لەدووری ١٦٠٠مەترەوە ببینێت و بۆنی بکات. کەڵبەدارەکان بەگشتی تەنها چوار پەنجەیان هەیە بە پەلەکانی دواوەیانەوە... ناتوانن بە درەختدا هەڵگەڕێن، بەڵام شەڕکەرێکی کارامەن.



# (١٢) مێش (الذباب- Flies)

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥٓۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخۡلُقُواْ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجۡتَمَعُواْ لَهُۥۖ وَإِن يَسۡلُبۡهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيۡـٔٗا لَّا يَسۡتَنقِذُوهُ مِنۡهُۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلۡمَطۡلُوبُ﴾ الحج/٧٣. واتە: ئـەی خەڵكینـە! نموونەیـەك هێنراوەتـەوە چاك گوێی بـۆ بگرن: بەڕاستی ئەوانەی كە لەجیاتی خوا هانا و هاواریان لێدەكەن، هەرگیز ناتوانن تاكە مێشێكیش دروستبكەن، هەرچـەندە بـۆ ئـەوكارە كۆببنـەوە و (یارمەتی یەكتریش بدەن) و ئەگەر مێشەكە شتێكیان لێ بفڕێنێـت، نـاتوانن پێی بزانن و لێی بسەننەوە، لەڕاستیدا هەم بتەكان لاواز و هیچ لێنـەهاتوون هەم مێشەكەش لاواز و بێهێزە.

مێش كوڵك لەسـەر لەش و پێیەكانی هەیە، هەربۆیە بەشداری لە كرداری پـەڕینی گـوڵ و ڕووەكەكانـدا دەكـات... خـوای گـەورە تەحـەددا دەكـات مـرۆڤ بتوانێـت ئـەو شـتەی مـێش دەیگرێـت و دەیبات لێی بسەنێتەوە. مێش خورتـومی هەیە و بەهۆیەوە خۆراكەكەی دەمژێت و لـەماوەی چـەند چـركەیەكی زۆر كەمـدا هەرسی دەكات و هەرگیز كـەس ناتوانێت لێـــی بســـێنێتەوە (ضَـعُفَ الطَّالِـبُ وَالمطلُوبُ).



مێش خورتومی هەیە خۆراکی پێدەمژێت و زمانی هەیە، ئەگەر مێش ڕێکەوتی خواردنێکی ڕەقی کرد (وەك شەکر) لیکی بەسەردا دەکات، دەتوێتەوە و خورتومەکە دەیمژێت. مێش چاوی گەورەی هەیە کە ژمارەیەکی زۆر هاوێنەی شەشی تێدایە یارمەتی دەدات بۆ بینین بە هەموو ئاراستەکاندا. زۆربوونی خێرایە و لەهەر جارێکدا نزیکەی ١٥٠ گەرا دادەنێت.

خواردنی مێش ئەندامییە، یان ئاژەڵییە یاخود ڕووەکی... مێش لەڕووی پۆلێن و پێکهاتەی لەش و هەندێك خووی وەك هەڵێنجانەوەوە (Regurgitation) لە مێشوولە دەچێت. دەتوانێت ماوەی ٣-٤ کیلۆمەتر لە خاڵی دەرچوونیەوە بفڕێت یاخود گەشت بکات بۆماوەی ٢٤ کیلۆمەتر. دڵی مێش ١٠٠جار لە خولەکێکدا لێدەدات.

# (١٢) باڵندەی شەلاقە (السلوى- Quail)

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ الْغَمَامَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ الْمَنَّ وَالسَّلْوَىٰ كُلُوا مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ البقرة/٥٧. واتە: لە ناز و نیعمەتەکانی خوا بۆتان ئەوەیە کە: ئێمە هەورمان بۆ کردوون بە سێبەر و گەزۆمان بۆ باراندن و پەلەوەری شەلاقەمان بۆ ناردن، دە بخۆن لەو پاک و پاکیزە چاکانەی پێمان بەخشیون (بەڵام لەبەر بێ دینی و ستەمیان) تۆڵەمان لێ سەندن، وەنەبێت ئێمە ستەممان لێ کردبن، بەڵکو هەر خۆیان ستەمیان لەخۆیان دەکرد.



قورئـان ئامـاژە دەدات بـەوەی منـەتێکی خوایە لەسـەر نـەوەی ئیسرائیل کە هـەموو رۆژەکانی هەفتـە جگـە لـە شـەممە خـۆراکی پێویستی پێدەدان، ئـەو (سلوى)یـەی خـوای گەورە بە نەوەی ئیسرائیلی بەخشیبوو، بۆ هەریەکـەیان بـەبڕاوی دەهـات، دەیخـوارد و نیـــسکەکانی جێدەهێشـــت و لەپاشـــان بـــە فـــەرمانی خـــوا دەبـــووەوە پەلەوەرەکە.

شەلاقە لە خێزانی باڵندە ماڵییەکانە و لە هەموو جیهاندا هەیە بەتایبەت لـە دوورگەکانـدا وەك دوورگـەی (مدگشـقر) و یابـان و گینیـای نـوێ و نیوزیلەنـدا و فیلیـپین... بـە کۆچـکەرەکانیش دادەنرێن. شـەلاقە چـەند جۆرێکی هەیە و لە کۆمەڵی گەورەدا دەژین کە هەر کۆمەڵە ١٠٠ باڵندەیە.

## (١٤) مەڕ (الضأن- Sheep) و بزن (الماعز- Goat)

خوا دەفەرموێت: ﴿ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍۖ مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِۗ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِۖ نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ الأنعام/١٤٣. واتە: (خوای گەورە) هەشت جووت مالاتی (بۆ خزمەتی مرۆڤ دروستکردووە) لە مەڕ جوونێك و لە بزنیش جووتێك (ئەی محمد (ﷺ) بەو نەفامانە بڵێ کە هەر لە خۆیانەوە شت حەرام دەکەن) ئایا خواردنی گۆشتی نێرەکان حەرامە یان مێیەکان یا ئەوەی لە سکی مێیەکاندا هەیە؟! ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن و بەڵگەیەکی زانستیتان پێیە، بۆمان ڕوون بکەنەوە.

مەڕ لەپێناو شیر و گۆشتەکەیدا بەخێو دەکرێت. سەرەڕای ئەوەی خوری و فەروەکەشی بەکاردەهێنرێت. مەڕ ساڵانە یەك جار دەزێت، جۆری مەڕ هەیە تەنها نێرە شاخی هەیە و هەیشە نێرە و مێیەیش هەیانە و مەڕیش هەیە بێ شاخە. ژمارەی پۆلەکانی مەڕ لە جیهاندا ٣٧ پۆلن... شاخی نێرەکان بەشێوەی بازنەیی خول دەخۆن، کاتێك بەگژ یەکدا دەچن



بەرەو یەکتر ڕادەکەن و خوارەوەی شاخەکانیان پێکدا دەدەن و

لەوەش دەنگێك دروستدەبێت و نوێ و دەشتەكەی كە تێیدان پڕ لەو سەدایە دەكەن، لەڕاستیدا ئەو جەنگین و بەگژیەكدا چوونە هیچ شوێنەوارێكی ئازار و برینی سەر و لەوجۆرە لای مەڕەكان جێناهێڵێت.

مەڕ دەتوانێت لەسەر گژوگیای كەم و زەوییەكی وشكەلانیش بژی. پێویستی زۆری بەخوێ هەیە و دەیخوات، چونكە ئارەزووی خواردنی زیاد دەكات و لەروەكەی لە حاڵەتێكی باشدا دەهێڵێتەوە و دەیپارێزێت.

لەروە ئەو خورییەیە كە لەشی داپۆشیوە و لە ئاووهەوای سارد دەیپارێزێت، لە هاویندا خوری مەڕ دەبڕدرێتەوە بۆئەوەی گەرمای هاوینی لەسەر كەم ببێتەوە، لە هەر برینەوەیەكدا نزیكەی ٢ كیلۆگرام خوری بەرهەم دێت.

بزن لە هەندێك وڵاتدا بە مەبەستی شیر و گۆشت و مووەكەی بەخێو دەكرێت. بزن مووی كورتە و قاچەكانی لە قاچی مەڕ درێژترن و بەزۆری لە وڵاتە گەرم و وشكەكاندا دەژین، لە ڕۆیشتن و جوڵەیاندا بە وزە و ئازاترن.



بزن توانای بەرگەگرتنی نەخۆشییەكانی هەیە و ئاسان بەڕێوەدەبرێت و بەخێودەكرێت... . شیری بزن لە شیری مانگا ئاسانتر هەرس دەكرێت. مێیەی بزنی ساڵی ١-٣ بێچووی دەبێت، لەدایكبوونی دوانەش زۆر باوە.

بەڵام بزنی کێوی لەهەر جارێکدا تەنها بێچوویەکی دەبێت و توانەیی تێدا زۆردەگمەنە. بزنی کێوی لەسەر بەرد و کەندەڵانەکان دەژی. لەش ڕێك و تاراده‌یه‌ك پێ جێگیرن و بەهۆی هەستە بەهێزەکانی چاودێری و بەردەوامییەوە ڕێ بە لێنزیکبوونەوەی دوژمنەکانی نادات. لە جوڵە و ڕاکردنیشدا خێرایە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَدَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ إِذۡ يَحۡكُمَانِ فِي ٱلۡحَرۡثِ إِذۡ نَفَشَتۡ فِيهِ غَنَمُ ٱلۡقَوۡمِ وَكُنَّا لِحُكۡمِهِمۡ شَٰهِدِينَ ﴾ الأنبياء/ ٧٨. واتە: داود و سولەیمان کاتێك کە دەربارەی ئەو بێستان و کشتوکاڵەی کە مەڕ و ماڵاتی هەندێك کەس تیایدا بڵاوبوونەوە بڕیاریان دەرکرد، زیانیان بە کێلگەکە گەیاند و ئێمە شایەت بووین لەسەر ئەو داوەری و بڕیارەی ئەوان.

# (١٥) بۆق (الضفدع- Frog)

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الطُّوفَانَ وَالْجَرَادَ وَالْقُمَّلَ وَالضَّفَادِعَ وَالدَّمَ آيَاتٍ مُّفَصَّلَاتٍ فَاسْتَكْبَرُوا وَكَانُوا قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴾الأعراف/١٣٣.

واتە: ئێمەش بەڵای لافـاو و کوللـە و ئەسـپێ و بـۆق و خوێنمـان بۆ نـاردن (بەدەسـت هـەر یـەکێك لـەو بەڵایانـەوە ماوەیـەك دەتلانـەوە و گیریـان دەخوارد) کەچی هەر خۆیان بـە زل و گـەورە دەزانـی، تـا بڵێـی قـەومێکی تاوانبار و تاوانکاربوون.

لەم ئایەتەدا باسی بۆق کراوە بـەوەی سـەربازی خـوا بـوون و بـۆ سـەر فیرعەون و نەتەوەکەی نێردران، بەشێوەیەك کە لە خواردنیاندا و تەنانـەت لە دەمیشیاندا هـەبوون، تـا بەداوایـەکی موسـا پێغەمبـەر (سـەلامی خـوای لێبێت) ئەو سزایە لەسەریان هەڵگیرا.

بۆق ئاژەڵێکی وشکاوەکییە، پێستێکی لوس و خـزی ڕەنـگ سـەوز یـان قـــاوەیی هەیـــە، نـزرجـــــــاریش پەڵەپەڵـــــــەن. چـاوەکانی و دەمـی گەورەن و پێیـەکانی دواوەی لـــــەوانی پێشـــــــەوەی گەورەترن و ئەوەش



یارمەتی بەئاسانی مەلەکردن و خۆ نقوم کردنی لە ئاودا و بەباشی بازدانی دەدات.

زمانی بۆق لە پێشەوەی دەمیدا چەسپاوە و بۆ ناوەوە نوشتاوەتەوە، لەلاکانی زمانیدا دەردراوی لینج هەیە و بە جوڵەیەکی خێرا بۆ مێرووی هەڵدەدات و پێوەی دەلکێنێت و کە نێچیرەکەی گرت زمانی بەرەو دەمی دەگێڕێتەوە.



# (١٦) جاڵجاڵۆکە (العنکبوت– Spider)

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًا وَإِنَّ أَوْهَنَ ٱلْبُيُوتِ لَبَيْتُ ٱلْعَنكَبُوتِ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴾ العنکبوت/٤١. واتە: نموونەی ئەوانـەی جگـە لـە خـوای گـەورە کەسـانێکی تـر دەکەنـە پشـتیوانی خۆیـان، وەك نموونەی جاڵجاڵۆکەیەك وایە کەماڵێك بۆ خـۆی سـازبکات، (بـە مـەرجێك) نابودترین و لاوازترین ماڵ ماڵی جاڵجاڵۆکەیە ئەگەر سـەرنجی بـدەن و تێـی بگەن.

لـەم ئایەتـەدا بەدیهێنـەر هـەواڵمان دەداتـێ ئـەوەی مـاڵی جاڵجاڵۆکـە دروستدەکات مێیەکەیە نەك نێرە، بە بەڵگەی بونی (تـاء التأنیـث) لەسـەر وشـەی (اتَّخَذَتْ). ئـەو ماڵـە مـاڵێکی لاوازە و لاوازییەکەشـی مادیـیـە هەرچـەندە لـە ڕایـەڵی جاڵجاڵۆکـە ڕایـەڵێك دروسـتکراوە بـەهێزتر لـەو ئاوریشمەی (کرمی ئاوریشم) دروستیدەکات.



سیفەتی ماڵ و لانەی نیشتەجێبوون ئەوەیە خاوەنەکـەی لـە سـەرما و گـەرما و ئـاڵوگۆڕی کـەش و ئـازاری زینـدەوەرە بـەهێزترەکان بپارێزێـت، بـەڵام ئـەم خەسـڵەتە لـە مـاڵی جاڵجاڵۆکـەدا نییـە. لاوازییـەکی تـر لـەڕووی کۆمەلایەتییـەوە، سـەلمێنراوە مێیـەی جاڵجاڵۆکـە لـەدوای زەماوەنـدکردن لەگەڵ نێـرەدا، نێـرە دەکوژێـت و دەرخـواردی بێچـووە بچـوکەکانی دەدات لەدوای دەرچوونیان لە گەراکانیان.

ئایەتەکە باس لەوە دەکات جاڵجاڵۆکە بەدەگمەن ماڵ دروستدەکات، وەك دەفەرموێت: (كَمَثَلِ ٱلۡعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتۡ بَيۡتٗا) چونکە جاڵجاڵۆکە بەدەگمەن ماڵ پێکدێنێت و وەك مێروویەکی گەڕیدە دەمێنێتەوە.

بڕوانە! پاکو بێگەردی بۆ خوای مەزن، لەکاتی کۆچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە مەککەوە بۆ مەدینە، جاڵجاڵۆکە دەست لە گەڕان و گەشتی خۆی هەڵدەگرێت و لە دەرگای ئەشکەوتی (الثور)دا ماڵی خۆی بۆ پارێزگاری خۆشەویستی خوا دروستدەکات.



جاڵجاڵۆکە هەشت قاچی هەیە، لەشی دابەش دەکرێت بۆ سەر و سنگ و سك. هەروەها هەشت چاوی هەیە، هێلانەکەی لە ڕایەڵی ورد پێکدێت (پێشتر باسکراوە) و ماوەی دروستکردنەکەی ٣٠خولەك دەخایەنێت.

دوای ئەوەی جاڵجاڵۆکە تۆڕەکەی (داوەکەی) بونیاتدەنێت لەژێر گەڵایەکدا خۆی حەشاردەدات، هەرکات مێش بەر تۆڕەکە دەکەوێت بەڕایەڵی پەیوەست بە جاڵجاڵۆکەکەوە جوڵەکەی دەنێرێت، لەوکاتەدا دەمودەست دەگاتە نێچیرەکە بەبێ ئەوەی قاچی بەر لانەکەی بکەوێت، دەیکوژێت و بەپەردەیەکی ئاوریشمی دەوری دەدات و بۆ نێوەندی لانەکە ڕایپێچی دەکات تاکو شلەکەی لەشی بمژێت و بخوات.

جاڵجاڵۆکەی دەرگایی چاڵێك دروستدەکات و بە ڕایەڵی تایبەتی خۆی داپۆشی دەکات و چاوەڕێی نێچیر دەکات، هەر کە گوێی لە ئەپە و دەنگی نێچیرەکە بوو دەستبەجێ دەیگاتێ، دەیگرێت و دەیکوژێت و دەیکاتە خۆراك.

## (١٧) قەلەڕەش (الغراب–Crow)

ئەودەمەی قابیل هابیلی برای شەهید دەکات و بەدەست تەرمەکەیەوە گیردەخوات و نازانێت چی بکات، خوای گەورە بۆ تێگەیاندنی قەلەڕەشێك دەنێرێت. پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابًا يَبْحَثُ فِي ٱلْأَرْضِ لِيُرِيَهُۥ كَيْفَ يُوَٰرِي سَوْءَةَ أَخِيهِ قَالَ يَٰوَيْلَتَىٰٓ أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَٰذَا ٱلْغُرَابِ فَأُوَٰرِيَ سَوْءَةَ أَخِي فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلنَّٰدِمِينَ﴾ المائدە/٣١. واتە: خوای میهرەبان قەلەڕەشێکی نارد و چاڵێکی لە زەویدا هەڵکەند (بۆ قەلەڕەشێکی مردارەوە بوو) تا نیشانی بدات چۆن لاشەی براکەی بشارێتەوە، (ئەوجا کە ئەوەی دی) وتی: هاوار لە من، من نەمتوانی وەکو ئەو قەلەڕەشە بکەم و بەقەدەر ئەوم پێنەکرا تا لاشەی براکەم ئەسپەردە بکەم، ئیتر بۆ هەمیشە چووە ریزی پەشیمانانەوە.



قەلەڕەش باڵندەیەکی گەورەی ڕەشە و لەبەر ڕەشییەکەی وەها ناونراوە. قەلەڕەش لاك و ئاژەڵە بچوکەکان و هێلکە و مێرووەکان دەخوات، لەم ڕووەوە بۆ کشتوکاڵ سوودی هەیە، بەڵام جۆری تری هەیە بەرهەمی کشتوکاڵی وێران و خراپ دەکەن.

قەلەڕەش کارامەیە و بینایی تیژە و زیرەکە و قاچەکانی بەهێز و ئامادەی ڕۆیشتنی درێژن. دەنووکی درێژ و بەهێزە. هێلانەکەی لە بەرزایی و ترۆپکی درەختەکاندا بونیات دەنێت. مێیەی

قەلەڕەش چوار هێلکە دادەنێت و چاودێری دەکات، نێرە خۆراکیان بۆ دێنێت، بێچووی قەلەڕەش دیمەنیان ناشیرینە.

وەك تێبینی دەکرێت قەلەڕەش لەسەر کارەسانەکان کۆدەبنەوە، جا ڕووداو بێت یان مردن، وەك ئەوەی مژدەی (هەواڵی) خراپەیان پێبێت دەفڕێنن... دەبێت ئاگاداربین پێغەمبەر (ﷺ) نەهی لێکردووین لە نموونەی ئەو کارانەوە ڕەشبین بین.



## (١٨) پەپوولە (الفراش- Butterfly)

خــوای میهرەبــان دەفــەرمووێت: ﴿ يَوۡمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلۡفَرَاشِ ٱلۡمَبۡثُوثِ ﴾ القارعة/٤. واتە: ئەو ڕۆژە خەڵکی وەکو پەپوولەی سەرگەردان پەرش و بڵاودەبنەوە.

پەپوولە ژمارەیەك هێلکە دادەنێت کە کرمۆکەی لێ دەردەچێت و خـۆراکی لەسـەر گـەڵای درەخـت دەبێـت پاشـان بـە قۆنـاغی قۆزاخـەدا تێپەڕدەبێت و تێیـدا دەمێنێتـەوە تـا گەشـەکردنی تـەولو دەبێـت و وەك پەپوولەیەکی کامڵ دێتەدەرەوە... تەمەنی هەندێك پەپوولە لـە هەفتەیـەك تێپەڕ ناکات و هەندێکیشیان بۆ ١٨مانگ درێژدەبێتـەوە. خۆراکی پەپوولـە لەسەر گوڵاو و گوڵ و دەنکەهەڵاڵەیە.



ژمارەی ئەو هێلکانـەی پەپوولە لـە هـەر جارێکدا دایانـــــــدەنێت ٤٥٠-٥٠٠ هێلکەیـە، بـۆ پارێزگـاری لێیان بەهۆی ماددەیەکی رایـــــەڵیی لکێنـــــەرەوە پێکیانـــەوە دەبەسـتێت، بـــــەوەش بـــــەملاولاد بڵاونابنەوە. لەدوای دەرچوونی ئەم کرمۆکانە بەهۆی ئـەو رایەڵانـەی خـۆی دەریـان دەدەن خۆیـان بـە لقوپـۆپی درەختێکـی گونجـاوەوە دەلکێنن

لەپێناو گەشەکردنیدا دەردراوی رایەڵی دەردەکات بۆ چنینی قوزاخەکە، هەموو ئەم کارانەش لەماوەی ٣-٤ رۆژدا ئەنجام دەدرێن.

لەم ماوەیەدا هەزاران جار ئەو رایەڵە بەدەوری خۆیدا دەگێرێت، لەئەنجامدا نزیکەی ٩٠٠-١٥٠٠ مەتر رایەڵ بەرهەمدێت، دوای ئەوەی لەم کارە تەواو دەبێت بەبێ وەستان دەست بە کاری خۆگۆڕین دەکات لە کرمێکی ناو قوزاخەوە بۆ مێرووەیەکی کامڵ (پەپوولە).

ئەگەر بەوردی تەماشای باڵی پەپوولە بکەین هاوتایی و (تناظر)ێکی روون دەبینین لە شێوەکانی و خاڵ و ئەو رەنگەی دەیرازێنێتەوە، بەراستی باڵەکانی پەپوولە وەک تابلۆیەکی جوان و قەشەنگ خولقێنراون. هەر باڵێکیان کتومت لە باڵەکەی تر دەچێت.



## (١٩) فيل (الفيل-Elephant)

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ﴾ الفيل/١. واتە: ئايا نەتبينی (ئەی پێغەمبەر (ﷺ)) پەروەردگارت چی بە خاوەن فيلەكان كرد؟!

جگە لە نەهەنگ فيل بە گەورەترين ئاژەڵە شيردەرەكان دەژميردرێت، بۆيە گەورەترين ئاژەڵی وشكايی (زيندوو)ە.

بەرزيی گەورەترين جۆری فيل دەگاتە سێ مەتر و نيو (لە زەوييەوە تا شانەكانی) و كێشی ٨تەن و ناوەندی تەمەنی ٦٠-٧٠ ساڵ دەبێت. پێستی زبرە و مووی پێوە نييە. پەلەكانی فيل لوولەكی گەورەن و وەك پايە وەهان و پێيەكانی كورتن و پێنج پەنجەيان هەيە.



فیل خورتومێکی درێژی هەیە کە بریتییە لە درێژبووەوەی لوت لەگەڵ لێوی سەرەوە، بەکاریدەهێنێت بۆ کۆکردنەوەی خۆراك و هەڵمژینی ئاو، جا ئەو ئاوە بەرەو دەمی دەبات یاخود بە مەبەستی خۆ فێنککردنەوە بەرەو لەشی دەیپرژێنێت، هەروەها هەوای پێ بۆن دەکات و بەهۆیەوە هەست بە بوونی ئاژەڵانی تر دەکات.

دوو شیفرەی گەورەی هەیە و هەر ئەوەش هۆکاری نەمان و بنەبڕبوونیانە، چونکە سەرچاوەی سەرەکی (عاج)ن. درێژی شیفرەی فیلی ئەفریقی ٧- ٨ پێیە و کێشەکەی ٩ کیلۆگرامە. گوێیەکانی فیل وەك پانکە کاردەکەن بۆ خۆشکردنی هەوای دەوری لەشی. دەکرێت پلەی گەرمی لەشی بە ئەندازەی ٩ پلەی سەدی بەهۆی زۆری موولوولەی خوێن لە لەشیدا دابەزێنێت و بەوەش گواستنەوەی گەرمی بۆ هەوای دەوروبەری ئاسان دەکات.

چاوەکانی فیل بچوك و دوور لەیەکترن، بەجۆرێك کە دەتوانێت بەگۆشەیەکی کراوە ببینێت.

فیلەکان بەکۆمەڵ دەژین. بۆ بەدەستهێنانی خۆراکی تەواو و پێویست دوور دەڕۆن. فیل ٥٠٪ی کێشی خۆی خۆراك دەخوات و ١٨٠ لیتر ئاو لە ڕۆژێکدا دەخواتەوە و بەیەکجار بە خورتومەکەی ٩ لیتر ئاو هەڵدەلوشێت.

## (٢٠) مەیمون (القرد- Monkey)

خــوای مــەزن دەفــەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعْتَدَوْا۟ مِنكُمْ فِى ٱلسَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَـٰسِـِٔينَ ﴾ البقــرة/٦٥. واتــە: "بێگومــان زانیوتانــە و ئاگادارن چیمان بەسەر ئەوانەدا هێنا کە ڕۆژانی شـەممان دەسـت درێـژییان دەکرد و لەسنوور دەرچووبوون، (لەبەرئەوە) پێمان وتن و (بڕیارماندا) کـە ببنە مەیمونی دوورخراوە (لەڕەحمەتی خوا).

بڕیاربوو جولەکەکانی شارەکەی قەراغ دەریا (ئیلیـە)، ڕۆژانـی شـەممان بۆ خواپەرستی تەرخان بکـەن و ڕاوەماسـی نەکـەن، دیـارە ماسـیيەکانیش هەستیان بەوە کردبووە، بۆیە لەو ڕۆژەدا خۆیـان نوانـدووە، جولەکـەکانیش بیریان لە تەگبیر و فێڵێك کردەوە، ئـەویش بـەوەی لـە ڕۆژی هەینیـدا داو و تۆڕیان بۆ بنێنەوە تا لـە شـەممەدا تێـی بکـەون، ڕۆژی یـەك شـەممان چـی کەوتۆتە داو و تۆڕەکانەوە دەریبهێنن، ئەمەش سەرپێچی فەرمانەکە بـوو، بۆیــە خــوای گــەورە ئــەو بڕیارەی بەسەردا دان".



مەیمونــەکان دووجــۆرن: مــەیمونی جیهــانی نــوێ و مەیمونی جیهانی کۆن کـە لـە ناوچە گەرمەکانـدا دەژیـن لـە ئــەفریقا و هینــد و ئاســیا. مەیمونی جیهانی نوێ لوتێکی پــان و کونــە لوتەکانیشــی

فراوانن.

لە جۆرەکانی مەیمون وەک گۆریلا و ئۆرانج و شەمپانزی و جابون. گۆریلا لە ئەفریقای ئیستوانی دەژی، کێشی قورسە و قەبارەشی گەورەیە و کلکی نییە. پێگەیشتوویەک لەم ئاژەڵە درێژیی دەگاتە دوو مەتر و نیو و کێشی ٢٢٥ کیلۆگرام... ئۆرانج لانەی خۆی لەسەر درەختی دارستانەکانی هێلی یەکسانی زەوی لە (بۆرنیو) دروستدەکات. شەمپانزی لە خۆرئاوای ئەفریقا و ئەفریقای ئیستوانی دەژی. جامبۆن بچوکترین جۆرەکانی مەیمونە کە لە خۆرهەڵاتی ئاسیا دەژی.

شەمپانزی بەناوبانگترین جۆرەکانی مەیمونە، سەرەڕای ئەوەی بە درەختەکاندا هەڵدەزنێت و لە لانەیەکی سادەی پێکهاتوو لە گەڵا و لقی درەختەکاندا دەخەوێت، بەڵام زۆربەی کاتی ژیانی لەسەر زەوی بەرێدەکات.

مەیمونە گەورەکان بە درەختەکاندا هەڵدەگەڕێن تاکو گەڵا و بەروبومەکانیان وەک خۆراک بەکاربێنن. مەیمونی بچوکیش جوڵەی زۆرترە، دوو دەست و باسکی درێژی هەیە بەهۆیانەوە دەجوڵێت و بەنێو درەختەکاندا بازدەدات، کلکیشی وەک پەلێکی تر بەکاردەهێنێت. پێڵوی خوارەوەی مەیمون بزانگی هەیە کە لە ئاژەڵانی تردا وەها نییە.

مەیمون خێرا تێدەگات و توانای لاسایکردنەوەی هەیە، هەستی بینین لە مەیموندا بەهێزە و لەپێشەوەی هەستەکانی تردایە. لە دوورییە زۆرەکانەوە دەبینێت و دەتوانێت پێگەیشتوویی میوەکانی پێ جیابکاتەوە.

مەیمون ١-١٢ جار دەزێت و بێچوویشی وەک مرۆڤ لە سکیدا هەڵدەگرێت.

## (٢١) شێر (القسوره- Lion)

خــواى گــەورە دەفــەرموێت: ﴿فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍ﴾ المــدثر/٥١. واتــە: لەدەستى شێر هەڵدێن.

(قسورة) بە زمانى حەبەشى واتە شێر. لە ئەسيوبيا و دەوروبەرى هەيە وەك سۆماڵ و سۆدان و گينيا. شێر لە ناوچە گژوگياييەكاندا دەمێنێتەوە و ژمارەيەكى كەميشى لــە هيندى خۆرهــەڵاتى خۆرئـاواش هــەن. پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەيەكدا كە ئيمامى بوخارى گێڕاويەتيەوە دەفەرموێت: (لە گــول رابكــەن (هــەڵبێن) وەك هــەڵاتنتان لــە شــێر). گــول ئەوكەســەيە كــە نەخۆشى گولى (Leprosy) هەبێت.



شێر لە خێزانــى پشيلە گــەورەكان (Feline) دەژمێردرێـــت. لەشـــى گەورەيە، درێژى لەشى شێرێكى تــەواو پێگەيشــتوو لــە لوتيــەوە بــۆ كۆتــايى كلكى ٩ پێيە واتە ٣مەتر. ئــەم ئاژەڵە باڵ و قژێكى ڕەنگ خــۆڵى يــان ڕەشــى هەيە بەدەورى گەردنيدا، ڕەنگە بگاتــە سكى، بەڵام دەڵەشێر ئــەو يــاڵ و قــژە تايبەتييەى نييە.

بەهۆى ئازايەتى و بەهێزييەوە شێر بە "شاى دارستان" ناودەبرێت.

شــەوانە شــێر بــۆ ڕاوكردنــى نێچــير

دەردەچێت. هێندەش بەهێزە دەتوانێت ئاژەڵە گەورەکانیش (وەك گامێش و گا) بکوژێت، بەلام تەمبەڵە و نایەوێت زۆر خۆی هیلاك بکات، بۆیە بە ڕاوکردنی مەڕ یان گوێدرێژی کێوی قەناعەت دەکات. شێر لە نێچیری ئاژەڵانی دی ناخوات، کە تێری لە نێچیرەکەی خۆیشی خوارد بەجێیدەهێڵێت و ئیتر ناگەڕێتەوە بۆی. شای دارستان لە سەرجەم ئاژەڵە دڕندە و ڕاوکەرەکانی تر زیاتر لەسەر برسێتی و تینوێتی ئارامگریی هەیە.

شێر ١٨ بۆ ٢٠ کاتژمێر دەنوێت و بۆژانە ٨ کیلۆمەتر ڕێ دەکات، لەکاتی برسێتیدا لەوانەیە ٢٤ کیلۆمەتر بەدووی نێچیردا بڕوات و بگەڕێت.

هەر ڕەوە شێرێك ناوچەیەکی تایبەتی هەیە و بەبۆنەکەی جیادەکرێتەوە کە بەناوچە دیاریکراوەکەیدا بلاویدەکاتەوە و بۆ دووریی نزیکەی ٤٠-٦٠ کیلۆمەتر بلاودەبێتەوە، بەتایبەت ئەگەر نێچیر دەگمەن بوو.



## (٢٢) ئەسپێ (القمل-Lice)

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الطُّوفَانَ وَالْجَرَادَ وَالْقُمَّلَ وَالضَّفَادِعَ وَالدَّمَ آيَاتٍ مُّفَصَّلَاتٍ فَاسْتَكْبَرُوا وَكَانُوا قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴾الأعراف/١٣٣.

واتە: ئێمەش بەڵای لافـاو و کوللـە و ئەسپێ و بـۆق و خوێنمـان بـۆ ناردن (بەدەسـت هـەر یـەکێك لـەو بەڵایانـەوە ماوەیـەك دەتلانـەوە و گیریـان دەخوارد) کەچی هەر خۆیان بە زل و گەورە دەزانی، تا بڵێی نەتەوەیەکی تاوانبار و تاوانکاربوون.

ئەسپێ لە مشەخۆرە تایبەتمەندەکانە، واتە هەموو ئـاژەڵ یـان مرۆڤێـك وەك یەك توش دەکـەن. تەنانـەت تایبەتمەندی جێگایشـی هەیـە، ئەسپێی سەر وەك ئەسپێی داوێنی سك نییە.

ئەم زیندەوەرە لە مشەخۆرە هەمیشەییەکانە (سـوڕی ژیانی بە هۆکـاری ژینگـەیی یـان کـاتی ناوەسـتێت)... کـوێرە و پێیەکانی چرنوکدارن. ئەسپێی شـیردەرەکان یەك چرنوکی هەیە و سەری بچوکە و دەمێکـی ئاشـکرای هەیـە و لـە جـۆری مـژەرە، ئـەم زینـدەوەرە هۆکـاری کـەم خـوێنی دەبێـت (ئەگەر توشبوونەکە بە توندی بوو).



ئەســپێی باڵنــدە دوو چــرنوکی بچــوك و ســەرێکی گـەورەیان هەیــە و کورتتریشــن. هەردوو جۆرەکە هەر پێست خراپ و بریندار دەکەن.

هەزاران جۆر ئەسپێ هەیە و هەندێك جۆریان نەخۆشی (وەك ریکتسیا و بوریلیا) بۆ مرۆڤ و ئاژەڵان دەگوێزنەوە. ئەسپێ خوێنی ئاژەڵان دەمژێت و بۆ هێلکەدانان پێست کونـدەکات. هەنـدێك جـۆری ئەسـپێ مشـەخۆرییان لەسەر کۆئەندامی هەناسەدانە هەر لە لوتەوە تا سییەکان.

ئەم مشەخۆرە لە ژینگەی جیاوازدا دەژی، هەندێکیان لە خـۆڵ و خاکدا لەنێو گژوگیا و گەڵا وەریوەکاندا، هەندێکیشیان لە ئاودا، جۆرێکی دیکـەش هەن لەسەر لەشی ئاژەڵانی تر دەژین.

باشترین چارەسەری ئەسپێی سەری مرۆڤ کە دیسانەوە لە رێنماییەکانی پێغەمبەری خوایە لابردنی مووی سەرە.

خوای گەورە مۆڵەتی بەو کەسانە داوە کـە ئـازاری سـەریان هەیـە وەك ئـەوەی بـەهۆی ئەسـپێوە بێـت، بـە لابردنـی مـووی سـەریان لـە حـەج و عومرەدا. وەك دەفەرموێت: ﴿وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ وَلَا تَحْلِقُوا رُءُوسَكُمْ حَتَّىٰ يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِ أَذًى مِّن رَّأْسِهِ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ فَإِذَا أَمِنتُمْ فَمَن تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ البقرة/١٩٦.

## (٢٢) سەگ (الكلب-Dog)

خـوای گـەورە دەفـەرمویّت: ﴿ وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ ۚ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث ۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا ۚ فَٱقْصُصِ ٱلْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴾الأعـراف/١٧٦. واتـە: خـۆ ئەگـەر بمانویسـتایە بـەو هۆکارانە بەرزمان دەکردەوە، بەڵام ئەو خۆی چەسپان بە زەوییەوە و (دەستیکرد بە دونیاپەرستی و) شوێنی ئارەزووەکانی کەوت. نموونەی (ئەو جۆرە کەسانە) وەکو سەگ وایە ئەگەر دەری بکەیت و پیامەڵشاخێی هەناسەبڕکێیەتی، یا وازی لێبێنیت هەر لە هەناسەبڕکێ ناکەوێت، ئەمە نموونەی ئەو کەسانەیە کە ئایەتەکانی ئێمە بەدرۆ دەخەنەوە، ئەم جۆرە بەسەرهاتانە بگێڕەرەوە بەڵکو (داچڵەکێن و) بیربکەنەوە.



دەم دەرهێنـان و شـۆڕبوونەوەی زمانی سەگ ئاسایی و تەندروستییە، چونکە بەو کارە پارێزگاری لە ڕێکخستنی پلەی گەرمی لەشی و پەستان دەکات، هەڵماندنیش هەر لەڕێی زمانیەوە ڕوودەدات و بەوەش بەدەستهێنانی فێنکی و فێنکبوونەوە

بەدیدێت.

پەیوەستییەك لەنێوان هەستی بۆنکردن و هەستی چەشتندا هەیە، لەبەرئەوە زمانی بەدیاردەخات بەهۆی چڵێسی و بۆنکردنی نێچیرەکەیەوە. بینراوە سەگ بەهۆی هەستی بۆنکردنەوە ترشە ناوەکییەکانی ئارەقی شوێنەواری پێیەکانی ئەوەی بەدوایدا دەگەڕێت دەگرێت و بەوپەڕی وردییەوە شیدەکاتەوە.

ڕێنمایی پێغەمبەر (ﷺ) هەیە بۆئەوەی کاتێك سەگ دەمی لە دەفرێك وەردەدات حەوت جاران بە ئاو بشۆرێت و جاری هەشتەمیش بە خۆڵ بێت، چونکە سەگ لەخۆگرێکی گەورەی ڤایرۆس و مشەخۆرەکانە. ئەو زیندەوەرە وردانەش لە لیکەکەیدان (وەك مەیمونەکان)، پیسوچەپەڵی و میکرۆبی زۆری پێوەدەلکێت و دەگرێت چونکە مردوو و پیسی دەخوات، باسکردنی خۆڵ و گڵێش لەلایەن پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) بە مەبەستی پاکژکردنەوە (تعقیم) یە.

سەگ شەویلگەی درێژ و کەڵبەی تیژی هەیە بۆ پەرتکردنی گۆشت و ٤٢ ددانیشی هەیە. لەشی بەهێزە و پێیەکانی درێژن و ئامادەی ڕۆیشتنی خێران. ئەم ئاژەڵە هەستی بۆنکردنی بەهێزە، هەربۆیە بەکاردەهێنرێت بۆ ڕاو و ئاشکراکردن و دۆزینەوەی ماددە هۆشبەرەکان. گۆشەی بینینی تەسکە بەجۆرێك کە دەتوانێت لەدوورەوە ببینێت، ناتوانێت ڕەنگەکان لەیەکتر جیابکاتەوە چونکە ڕەنگ کوێری هەیە. هەستی بیستن لای سەگ دەگاتە لەرەلەری ٧٠هەزار بۆ ١٠٠هەزار (مرۆڤ لەرەلەری نێوان ٢٠ تا ٢٠هەزار هێرتز دەبیستێت). خەڵك سەگ بۆ پاس کردنی ماڵ و مەڕومالاتیان لە دز و گورگ ڕادەگرن.

پێویسته سەرنجی ئەو خاڵە بدەین کە تەنها ڕاوی سەگی ڕاهێنراو حەڵاڵـــــــە. ﴿يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمْ ۖ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ ۙ وَمَا عَلَّمْتُم مِّنَ ٱلْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ ٱللَّهُ ۖ فَكُلُوا۟ مِمَّآ أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ وَٱذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ﴾المائده/٤. واتە: پرسیارتان لێدەکەن چی حەڵاڵە بۆیان؟ پێیان بڵێ: هەرچی خۆراکی چاك و پاکە بۆتان حەڵاڵە، ئەوەش کە باڵندە و ئاژەڵی شکاری بۆتان ڕاودەکەن و فێرتان کردوون، دە بخۆن لەوەی کە بۆتان دەگرن و ناوی خوای لێ بێنن کاتێك کە بەرەڵای دەکەن، و کاتێك کە لێی دەخۆن، هەر لەخوایش بترسن و پارێزکاربن (ئەی ڕاوچییەکان)، بەڕاستی خوا بەخێرایی لێپرسینەوە ئەنجام دەدات.

## (٢٤) هەنگ (النحل – Bees)

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِى مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴿٦٨﴾ ثُمَّ كُلِى مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسْلُكِى سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ النحـل/٦٨–٦٩. واتـە: پـەروەردگاری تـۆ (ئـەی مـرۆڤ) نیگـا و ئیلهامی کردووە بۆ هەنگ کە جێگـا بـۆ خـۆی لـە کـون و کـەلێنی چیاکاندا سازبکات، هەروەها لە کەلەبـەری درەختـەکان و لـەو شـوێنانەش کـە مـرۆڤ بۆی ئامادە دەکات... پاشان (فێرمان کردووە کـە) لـە هـەموو بـەروبووم و (شـیلەی گـوڵان و شـتی بەسـوود) بخـوات، پێمـان ڕاگەیانـدووە، ئـەو نەخشانەی کە پەروەردگارت بۆی کێشاوی بە ملکەچییەوە ئـەنجامی بـدە، جا لەناو سکی ئەو هەنگانـەوە شـلەیەکی ڕەنـگ جیاواز دێتـە دەرەوە کـە شیفایە بۆ (زۆر نەخۆشی) خەڵکی. بەڕاستی ئا لەمەشدا بەڵگـە و نیشانەی بەهێز هەیە بۆ کەسانێك کە بیربکەنەوە.

بڕوانـە ئایەتەکـە کـە لـەبارەی شـوێنگەی هەنگـەوە دەدوێـت: شـاخ و درەخت و ئەو جێگایانەی مرۆڤ خۆی بۆی سازدەکات... پاشان دەفەرموێت ( ثُمَّ كُلِى مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ )، هـەنگ ئـەو سـیفەتەی لەسـەرجەم مێـرووەکانی تـر جیاوازە بەوەی لـە هـەموو بەروبوومـەکان دەخـوات (تـرش و شـیرین) نـەك تەنها یـەك جۆر بـەروبووم. هـەموو ئەوەشـی بـۆ بەرهـەمهێنانی هـەنگوینی هەیەتی.

(فَٱسْلُكِى سُبُلَ رَبِّكِ ) گوتارەکـە لێـرەدا ئاڕاسـتەی مێیەکانـە ئـەویش

هەنگە ئیشکەرەکانن بەو سیفەتەی ئەوان گوڵاو کۆدەکەنەوە و هەنگوین دروستدەکەن.

سەلمێنراوە کە ڕێگایەکی دیاریکراو هەیە سەرجەم ئیشکەرەکانی پێدا دەڕۆن، ئەویش ئەوەیە کە پێیدەگوترێت (سُبُلَ رَبِّكِ). تەنانەت سەمایەکی تایبەتی هەنگەکان هەیە بۆ لێك تێگەیشتنیان (جا لەبارەی بوونی شوێنی گونجاو بێت یان بوونی ئەگەری مەترسی).

(ئایا دەزانیت یەك کیلۆگرام هەنگوین پێویستی بە هەوڵ و کۆششی ١٥هەزار کاتژمێری کاری یەکبینەی هەنگ هەیە (واتە ساڵێك و پێنج مانگ)؟ بۆئەوەش دووری ٢٢٥ کیلۆمەتر دەبڕێت لەو نەخشەیەی خوا بۆی کێشاوە، بەڵام ئەم کۆششە کۆمەڵگای هەنگ بەهاوکاری و بەبێ ماندوبوون پێکەوە پێی هەڵدەستن. بۆیە خوای گەورە وشەی (ذُلُلًا) بەکاردێنێت، واتە فەرمانپێکراو و رامکراوە بۆ ئەم مرۆڤەی ڕێزمان لێگرتووە، تۆیش (ئەی هەنگ!) شەرابێکی ڕەنگ و جۆر جیاوازی بۆ دروستبکە.



هەنگ ٧٠٠ ڕەگەزی هەیە کە ٢٠ هەزار جۆر دەگرێتەوە.

درێژی گەورەترین جۆری هەنگ ٤ سانتیمەترە و بچوکترینیشیان ٢ ملی مەترە، تێکڕای درێژی هەنگی بەرهەمهێنی هەنگوین ٢ سانتیمەترە.

هەنگ مێروویەکی باڵدارە و لە کۆمەڵ و پورەدا دەژی و تەنیا دایکێکی هەیە ئەویش شاژنە کە دوو ساڵ یان سێ ساڵ دەمێنێتەوە و هەزاران هێلکە (گەرا) لەنێو خانە مۆمییەکاندا دادەنێت کە ئیشکەرەکان

دروستیدەکەن. ژمارەیەکی کەم نێرە هەن کە شاژن بەر لە دانانی هێلکە دەپیتێنێت و پاشان دەمرێت.

لە گەراکانەوە کرمۆکەی بچوك دەردەچن و هەنگە ئیشکەرەکان چاودێرییان دەکەن و خۆراکیان پێدەدەن تا گەورە دەبن. هەنگ چزووی هەیە کە بۆ بەرگریکردن لە خانەکەی (پورەکەی) بەکاریدێنێت. ئەندامی پێوەدان لە چزوو و دەردراوێك پێکدێت کە لە کۆتایی سکی هەنگەکەدایە و لەکاتی هێرشکردن بۆ سەر هەر بوونەوەرێکی هێرش بۆکراودا پێوەدەدات و ژارێکیشی لەگەڵدایە کە ڕژێنێکی تایبەت دەریدەدات. ئەم زیندەوەرە دەتوانێت تیشکی سەرووەنەوشەیی ببینێت کە مرۆڤ توانای بینینی نییە.

هەنگوین زۆر جۆری هەیە و بەپێی ئەو ناوچەیەی لێی کۆدەکرێتەوە و وەرزی کۆکردنەوەکە دەگۆڕێت، باشترین جۆری ئەوەیە کە لە بەهاردا کۆدەکرێتەوە. هەنگوین پێکدێت لە ٢٠٪ ئاو و ٧٩,٥٪ کاربۆهێدرات و ٠,٠٤٪ ڤیتامین **B2** و ٠,٤٪ ترشی ستریك و کالیسیۆم و مس.

سوودە تەندروستییەکانی هەنگوین ئێجگار زۆرن، کەمێك لەوانە: چالاککارە، ئارەزووی خواردن زیاد دەکات، چارەسەرە بۆ نەخۆشی جگەر و یارمەتی لابردن و نەهێشتنی ژار دەدات. هەنگوین بۆ چارەسەری سوتاوی و قڵیشبرینەکان بەکاردێت و نەرمکاری پێستە و لە قڵیشان دەیپارێزێت. ئەمانە و چەندین و چەندین سوودی تەندروستی تر.

بۆ زانینی بەها و سوودی گەورەی تەندروستی هەنگوین هێندە بەسە کە خوای گەورە دەربارەی دەفەرموێت: ﴿فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ﴾.

## (٢٥) مێرووله (النمل– Ants)

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوۡاْ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمۡلِ قَالَتۡ نَمۡلَةٌ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمۡلُ ٱدۡخُلُواْ مَسَٰكِنَكُمۡ لَا يَحۡطِمَنَّكُمۡ سُلَيۡمَٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ﴾ النمل/١٨. واتە: هەتا گەیشتنە دۆڵی مێرووله، مێرووله مێچکەیەك (هـاواری کـرد و) وتـی: ئـەهای مێروولەینـە بچـنە مـاڵ و کـون و کەلەبەرەکانتانـەوە نەوەکو سولەیمان و سەربازانی پێشێڵتان بکەن و هەستتان پێنەکەن.

ئایەتەکـە دەفـەرموێت مێروولـە لـە دۆڵەکانـدا دەژی. دەفـەرموێت: مێروولەکـە (النملـة) (کـە ئامـاژەیـە بـۆ زۆریـنـەی ڕەگـەزی مێروولـە کـە مێیـەکانن، ئیشـکەرن و دەنکۆڵـەکان کۆدەکەنــەوە)، گوتویــەتی: بڕۆنـە ژوورەوە بـۆ شـوێن و مەنزڵگـەکانتان تـاکو نـەمرن بـە تێکشـکان (واتـە نەشـکێن) لـەژێر پێـی سـولەیمان پێغەمبـەر (سـەلامی خـوای لێبێـت) و سـەربازەکانیدا. ئـەم گوتەیـەی بـە ئەدەبـەوە دەڵێـت و بیانوویـان بـۆ دێنێتـەوە: ﴿وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ﴾ واتـە ڕەعیـەتێکی گوێڕایـەڵ بـۆ سـەرۆك و حاکمەکەی.

ڕایەك هەیە دەڵێت دەستەواژەی (لَا يَحۡطِمَنَّكُمۡ) لێرەدا بەڵگەیە لەسەر سروشتی جومگەیی لەشی مێرووله (Arthropods) کە پێویستی بە تێکشکان (تحطیم) هەیە، چونکە جەستەی دەرەکیی لە ماددەیەکی ڕەقـی وەك شووشە پێکهاتووە کە پێیدەڵێن (کیتین–Chitin)... ئـەم ماددەیـە لـە پێکهاتنیـدا هاوشـێوەی مـاددەی پێکهاتـەی شـاخی ئـاژەڵان و سـم و

نینۆکە. هەروەها ئاشکراکراوە چاوی مێروولە سروشتێکی کریستاڵیی هەیە وەك شووشە بە ئاسانی ناشکێت، بەڵکو پێویستی بە تێکشکاندن هەیە.

لە هاویندا شەو و ڕۆژ مێروولە کاردەکەن بۆ کۆکردنەوەی بەرهەم و دانەوێڵە و پێداویستی خۆیان و بۆ وەرزی زستان خەزنی دەکەن... هیچکام لەو دەنکۆڵە گەنم و جۆ و بەروبوومانەی کۆیدەکەنەوە لەلانەکەیاندا گەشە ناکەن، چونکە دەنکۆڵەکان دەکەن بە دوو لەتەوە، ئەگەر وەها نەکەن قەد و ڕەگی ئەو تۆو و دەنکۆڵانە گەورە دەبن و ماڵ و لانەکەیان خاپور و وێران دەکەن.

ئەگەر مێروولە هەستی بە شێداربوونی دەنکۆڵە گەنمەکان کرد، دەیانباتە دەرەوە و لەبەر هەتاودا هەڵیاندەخات بۆنەوەی وشك ببنەوە. مێروولە تاکە زیندەوەرە بتوانێت لە کێشی خۆی زیاتر هەڵبگرێت.



## (٢٦) پەپوو (الهدهد- Hoopoe)

خوای گەورە لەسەر زمانی سولەیمان پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) دەفـــــەرموێت: ﴿وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيْرَ فَقَالَ مَا لِىَ لَآ أَرَى ٱلْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ ٱلْغَآئِبِينَ﴾ النمـــل/٢٠. واتـــە: (ســـولەیمان) کەوتـــە بەســـەرکردنەوەی دەستەو تاقمی باڵندەکان و وتی: ئەوە بۆ من پەپوو نابینم، یاخود لێرە نییە و خۆی دزیوەتەوە؟!

پەپوو گەڕایەوە، خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ﴾ النمـــــل/٢٢. واتـــــە: (سولەیمان) زۆر چاوەڕێی نەکرد، (پـەپوو پەیدابوو، یەکسەر هات و نیشتەوە و) وتی: ئەوەی من پێم زانیـوە تـۆ پێت نەزانیوە، من لـە (وڵاتی) سەبەئەوە هەواڵێکی ڕاست و دروستم بۆ هێناویت!!



عبداللـــەی کـــوڕی عـــەباس گوتویەتی کە (پەپوو) لەنێو زەویدا دەبینێـــت... لـــە ئایەتەکەشـــدا دەبینین پەپووەکە لە شامەوە بۆ یەمـــەن ســـەفەری کـــردووە بـــەنێو بیابانی حیجازدا تادەگاتـە بەنـداوی

مەغرەب لە وڵاتی سەبەئدا. ئەم باڵندەیە باشترین ڕێنمایکارە بۆ گەڕان بەدوای ئاوی شیرین لە بیابان و زەوییە وشك و چۆڵەکاندا.

(پەپوو) لە باڵندە ناسراوەکانە بە جوانییەکەی، درێژیی نزیکەی ٣٠ سانتیمەترە و دەنوکیشی ٥ سانتیمەتر. کڵاوێکی هەیە لە سەرەوە ڕەشە. ڕەنگی پەپوو قاوەییەکی سورباوە و پەڕی باڵەکان هێڵداری سپی و ڕەشن، کلکی ڕەشە و تەختەکەی سپییە.

ئەم باڵندەیە مێروو و کرمی زەوی دەخوات و لانەکەی لە جێگای جیاواز لە کەلێنی بەرد و قەدی درەختەکاندا بونیات دەنێت، بینایییەکی تیژی هەیە و خێرا دەفڕێت... ناسراوە بەوەی زۆرتر ترسنۆکە و هەر کە هەستی بە مەترسی کرد خۆی بە زەویدا دەکێشێت و وەك مردوو خۆی پیشان دەدات تاکو مەترسییەکە نامێنێت.



## سەرچاوەکان

١. تەفسیری ئاسان، بورهان محمد أمین
٢. موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن الكريم، عبدالرحيم الماردينى
٣. الإعجاز العلمي في القرآن الكريم، محمد سامي محمد علي.
٤. حقائق العلم الحديث (١-١٠)، عبدالرحمن العصاني.
٥. الإعجاز العلمي في القرآن، السيد الجميلي.
٦. موسوعة الإعجاز القرآني في العلوم و الطب و الفلك، د.نادية طيارة.
٧. مجلة الإعجاز العلمي، عدد (٣، ٤)
٨. الحيولنات في القرآن الكريم،